# کێشەی جەزائیر و
# چەند پەندێك بۆ دۆزی کورد

نووسینی

مسعود عبدالخالق





١٤١٩ - ١٩٩٨

# کێشەی جەزائیر
# و
# چەند پەندێك بۆ دۆزی کورد

نووسینی

مسعود عبدالخالق

بسم الله الرحمن الرحيم

# وسيعلم الذين ظلموا أي منقلب ينقلبون

چاپی یەکەم

## سەرەتا

کورد وەك گەورەترین میللەتی سەر ئەم زەمینە و بێ وڵاتیشە، بۆیە تێکۆشانی ئەو میللەتە سەومرێکی زیاترە لە هەموو میللەتانی تر لە لایەکەوە تێ دەکۆشێت بۆ دروست کردنی کیانێکی سیاسی و لە لایەکی تریشەوە بۆ پێك هێنانی کۆڵگەیێکی دادپەروەرانە، کە بەلای زۆربەی مەدرەسەو لایەنە عیلمانیەکانەوە ئەو دوو تەوەرە پێکەوە ئەنجام نادرێ و خەوبەکانی کورد بەو زووانە نایەتە دی، بەڵام بە روانگەی ئیسلام هەردووکیان پێکەوە گرێ دەدرێ و بە ئەزموونی زیندوش سەلێندراوە رێگەش کورت دەبێتەوە، کەواتە تێکۆشانی خەڵکی کوردستان زۆر پێویستی بە شارەزا بوونی ئەزموونی گەلان هەیە بە تایبەتی رابەرایەتی بزوتنەوەی کورد پێویستە ئەو پەیوەندیەی نێوان کێشەی کورد کێشە جیهانیەکان بدۆزێتەوە و بزانێت کام تەوەری جیهانی چارەنووسی لە قازانجی کورد دایەو چی تریش پێچەوانەیەو ستراتیژیەتی لە سەر ئەو بنچینەیە دابرێژێت، لەو رووەش هەتا ئێستا رابەرایەتی کورد بە هەردوو باڵی ئیسلامی وعیلمانی لە تێ ووردبوونەوە لە گۆرانکاریە ئەقلیمی و دوەلیەکان لە مەدرەسە خەتە فیکریەکان یان لە قەدیسیش ماون یان تەبەعی بوینەو لاسایی‌یەکی وێنەیی مەدرەسەیێکیان کردۆتەوە بێ داهێنان و رەچاوی واقیعی تایبەتی کوردستان، هەموو ئەو کۆمەڵە هاوکێشە ستراتیژیو ئاڵۆزانەش سانە دەبێت کاتێ پلەی وشیاری خەڵك بەرز بێتەوە و شارەزای دیوی ناوەوەی رووداو گۆرانکاریەکانی نێو هاندەران بن (لەو رووەش خەڵکی کوردستان تا رادەیەکی چاك وا شارەزا بووینە و زیاتریش) ئەوروپا لە پێش ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژایەی ئێستای بە قۆناغی (عصر التنویر) تێ پەرین کە شارەزاوو فەیلەسوف و زانایەکی زۆریان لێ پەیدا بوو و رۆشەنبیریش زۆر باوی هەبوو ئەو ئەنجامەی ئێستای لێ هاتە دی، بەڵام ئێستا ئەو رۆشەنبیریە زور روو لە کزییە هەر بۆ نموونە ساڵی ۱۹۹۳ لە راپرسێکی خوێندکارانی بەشی ئامادەیی بریتانیادا ناخو کێ سەرۆك ومزیرانیانە دەرکەوت لە ٦١٪ ووتبیان مەرگرێت تاتشەر و لە ١٩٪ هیچ و لە ٢١٪ ووتبیان جۆن مێجەر (کە ئەو کاتی ئەو سەرۆك ومزیران بوو) سەرنج بدە چارەنووسی ئەو شارستانیە بەرەو هەڵدێرە زۆر بێ ئاگان لە کاتێکا لە کوردستان و زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی پلەی رۆشەنبیری بەرەو پێشە، بۆیە وا چاوەروان دەکرێت کە خەڵکی کوردستان لە دوای رزگاری میللەتێکی شارستانی و پێشکەوتووی پیشەسازیشی لێ دەرچێت. جا لە سەر ئەو رەوتە با پێش برکی بکەین (وفي ذلك فليتنافس المتنافسون) هەر یەکە لە لای خۆمان دەروازەیەکی جیهانی بۆ کورد بکەینەوە زانیاری ئیجابی، ئەزمونی گەلان، راستی دیوی ناوەوەی روداوەکانی نێو وڵاتان بۆ کورد بە ئەمانەتەوە نەقل بکەین ئەم نووسینەش تەقلایەکە بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە بەو هیوایەی کەلینێکی بچوك لەو بۆشاییە گەورەیە پر کرابێتەوە.

## کێشەی جەزائیر:

بریتییە لە جەنگی نێوان حکومەتی عەسکەری بە سەرۆکایەتی (الیمین زروال) و جەنەراڵە عەسکەریەکان (خالد نزار- عباس طذین- محمد عماری) - وە بەرەی ئیسلامی چەکدار لە گوندو شاخەکان بە سەرۆکایەتی کۆمەڵێك پرۆفیسۆر و دکتۆری زانکۆیەکان وەك پرۆفیسۆر (عباس مدنی) کە تا پێش ماوەیەك لەمەوبەر لە بەندیخانە بوو. ئەو کێشەیە سەری هەڵدا لەدوای ئینقلابەکەی ١١-١-١٩٩٢ وهەڵبژاردنە بەناوبانگەکەی ١٩٩٢ کە هەڵوەشێنرایەوە کە تیایدا بەرەی ئیسلامی رزگاری (ئینقاذ) لە ٨٦٪ دەنگەکانی بەدەست هێنا، بێئەوەی چەقۆکێشیان هەبێ. وە بەرەی رزگاری نیشتمانی (جبهة التحرير الوطني) تەنیا ٦٪ دەنگی هێنا. هەرسێ سەرۆك (بوضیاف- علي کافي- الیمین زروال) کە سەر بەو بەرەیەن ئەمانە لە بازنەکەی خۆشیان دەنگیان نەهێناوە. کەچی ئیستا سەرۆك کۆمارە بەو نیسبەتە دەنگە و (د.عباس مدنی) کە پرۆفیسۆرە لە (علم النفس) یەکێکە لە رەوشەنبیرەکانی ئەفریقیایە تا ماوەیەك پێش ئێستا لە بەندیخانە بوو سەرەرای ئەو دەنگەی کە هێنای.. واتە: هەموو میللەتی رەوشەنبیری جەزائیر ئیسلامیان خواست بەو رێگایەی کە گوایە شەرعیەتی هەیە لە رژێمی جیهانی نوێدا. کەچی ئەو دەسەلاتدارە کەمایەتیەش بە پشتوانی زۆردارانی دونیا نایسەلمێنن. ئەوەیە سەرچاوەی کێشەکە. کە دەبوایە بریاری (الأمم المتحدة) دەرچوبایە وەك (سیرالیۆن، گرنیادا، نایجیریا، ئەنگۆلا....هتد)، وە هەموو وولاتانی دونیا و حزب و لایەنەکان تەئیدی بەرەی رزگاری ئیسلامیان بکردبایە ئەگەر راستە ئەو هەموو هاوارە بۆ دیموکراتیەت... ئەدی دیموکراتیەت سەرنەبرا لە جەزائیر.. ئەو کێشەیە بۆ دونیای سەرمایەداری و سیستەمی نوێی جیهانی ئێستا بە ئەندازەی دیواری بەرلین عەیبدارە، جا بۆ ئەوەی ئەو راستییە زەقە لە پێش جیهان چەواشە بکرێ و داپۆشرێ ئەمرۆ هێرشێکی راگەیاندنێکی بەهێز دژی موجاهیدانی جەزائیر بەرپا کراوە، گوایە ئەوانە دژی دیموکراتیەتن! دژی رەوشەنبیرین، دژی خەڵکی لایەدەن... لە دوای هەمووان ئەو قەتل و عامەی دژی هاولاتیانی بێ چەك و لایەنگیرانی ئیسلام دەکرێت دەیدەنە پاڵ هێزە چەکدارەکانی ئیسلامی کە هیچ مەنتیقیك ئەوەی قبوڵ نییە... جا ئەوەیە ئامانجی سەرمایەداری جیهانی لەو هێرشە بەلام دەبێ رۆژنامەکان و لایەنە چەپەکانی کوردستان مەبەستیان چی بێت لەو چەواشەیە؟ خۆ دەبوایە ئێوەی نوسەرانی کورد هەرچیەك بن، چ دیموکراتی خواز چ چەپی بەراستی، دەبوایە لایەنگیری کێشەی رەوای گەلی جەزائیر بوونایە، چونکە ئەگەر باوەرتان بە دیموکراتی هەبێت ئەوا دیموکراتی بووە قوربانی ئەو سەدەیە ئەگەر چەپیشن ئەوا کەوتنە سەنگەری ئیمپریالیزمی جیهانی وەك خۆتان دەڵێن، کەچی هاورێیانی شیوعی و مارکسیەکان و سۆشیاڵ دیموکراتیەکانی کوردستان وەك بەشێك لە راگەیاندنی (برجوازی) جیهانی لە خزمەت کەمایەتی حوکمرانی جەزائیرن، بەلام ئەو هەقەش بڵێن

ئەوانەی نیرەش ناهەقیان نیيە. ئەگەر چی سەرمایەداری جیهانی لە ئیسلام دەترسی وەك ئەدەل ئه ئیستا بە خیرایی دێتە پێش و حەتمەن دەگاتە جێش. ئەوانەی نیرەش لەو ... ەكدەگرنەوە و چون هەنجەتی قەلۆش بوونیان لە فیكرو جەماوەر، چەك و چۆك دا دانان دەربرن، ئیستا لەو جیهانە توانای هیچ بەرگریەكیان نەماوە. نە بە ئاشتی نە بەتوندی بۆیە پێویستە بۆ ئەوانیش ئەو شۆرشگێر بە توانابیانە لەكەدار بكەن... ئا لێرەوە یەك دەگرنەوە. هەردوولا هەموو زۆردارانی دونیا و دەست پێوەندەكانیان ترسیان گەیشت بوێ ((الكفر ملة واحدة)) جا بۆئەوەی خەڵكی كورد زیاتر چەواشە نەبێت و ڕاستییەكانی جەزائیری لێ نەشێوێ كە زۆر پەیوەندیدارە بە كێشەی ئێمەش، ئەوا ڕۆشنایەكی زیاتر دەخەینە سەر كێشەی جەزائیر ڕەوتی ڕووداوەكان لە پێش و لە كاتی ئاسوی دیموكراتی كە ڕژێمی جیهانی نوێ وایزانی سیستەمی دیموكراتی سەلامەت ترین سیستەمە بۆ مانەوەی خۆیان، زۆر لە نوسەران ڕەوشەنبیرانی خۆشمان وای تێگەیشتبون گوایە ئەو بیداریە ئیسلامییە بە دیموكراتی بەربەست دەكرێت، بەلام تەواو پێچەوانە دەرچوو، دیموكراتی بووە ئەو قەبرەی بە دەستی خۆیان بۆ زۆردار و دكتاتۆریان لێدا، بەو شێوەیە لە جەزائیر لە تورکیا و ئوردن و فە لە سطين و لبنان و پاكستان و كۆمارەكانی سۆڤیەتی پێشوو... لەهەر شوێنێك دیموكراتی هەبوو بێت ئیسلام بە خێرایی گەشە دەكات بۆیە یەكەیەكە دەسەلاتەكانی سەپاو بەسەر خەڵكا بە دیموكراتیش پەشیمان بوونەوە و سەرمایەداری جیهانیش لێی ئاشكرابوو كە بەو دیموكراتیە ڕازی نین ئیسلامی لێ پەیدا بێت. ئەوەیە كێشەی جەزائیر ئەو شۆرشە پیرۆزەی دژی فكرو ئاشتی پەیدا نەبووە بەڵكو دژی مەنتیقی هێز بووە كە خۆسەپاندنە بە هەر شێوەیەك بێت.

## گرنگی جەزائیر

**جەزائیر:** دەكەوێتە سەرووی ئەفریقیا دەوری دراوە بەو وولاتانە، لە سەروو دەریای ناوەراست. لە ڕۆژهەلات لیبیاو تونس، لە ڕۆژئاوا مەغریب و بیابانی ڕۆژئاوا. لە خواروو نایجەر و مالی و مۆریتانیا. جەزائیر خۆشی پایتەختی جەزائیرە و بۆ (١٥) ئوستان دابەش كراوە. لە شارە گەورەكانی لە دوای جەزائیر، قسنطنية وهران كە (بەندریشە)، تەلمسان، خاكەكەی لە شاخ و داخ و دارستان و بیابان پێك هاتووە. پانابیەكەی ٢,٣٨١,٧٤١ كم٢، ئیستا دانیشتونایان (٢٧) ملیۆن دەبێت/ گوزەرانی بە تیكرایی بەو شێوەیە: (متوسط دخل شهريا) ١٥,٠٠٠ دیناری جەزائیریە. یەك دۆلار دەكاتە ٦٠ دیناری جەزائیری كە سەرجەم دەكا (متوسط دخلي شهريا) بۆ هەر نەفەریك دەكاتە (٨٠) دیناری عیراقی جاران. وە بەردەوام نرخی دیناری دێتە خوارێ لە ئەنجامی ئەو جەنگەی ئیستای حكومەتی جەزائیر و موجاهیدان هەچەندە كۆمەكی بەرفراوانی ئابوری و تەقەمەنی لە ئەوروپا و ئەمریكاش بوی دێ. داهاتەكانیان وەك سامانەكانی نەوت، كشتوكال، پیشەسازی، لەچاو ئەفریقیا پیشكەتوون. گومانی

لیدەکرێ ئێستا بنیاتی نەوەوی لێ بکرێ. هەروەها جەزائیر وا بەناوبانگە کە فەرەنسای ئەفریقیایە. چونکە وولاتێکی کراوەیە و خەڵکەکەشی رۆشەنبیرن و تێکەڵاویەکی زۆریشیان لەگەڵ ئەوروپا هەیە. لە ناو وولاتانی عەرەبیش بە پێشەنگی عەلمانیەت دادەنرێ لەگەڵ وولاتانی وەك یەمەن و سوریا و عێراق... لەلایەن مارکسیەکانەوە بە بەرەی پێشکەوتوو بەرەو شیوعیەت رۆیشتو حیساب دەکرا و بە وولاتی ملیۆن شەهید بەناو بانگە.

## کەمێک لە مێژوو

دوای ئەوەی قیصر لە ساڵی ٤٢ پ.ز لەدەست قرتاجەی ستاندەوە کردیە هەرێمێك لە رۆمانیا هەتاکو ئیسلامی گەیشتێ لە ساڵی ٦٨٢ز دەوڵەتی فاطمی گەیشتێ، لەدوای سەدەی (١٤) لە ساڵی ١٥٨١ز کەوتە دەست ئیسپانیا، ئەنجا دوای چوار سەدە بە جێیان هێشت لە ئەنجامی لاوازی و بێ توانایی عوسمانیەکان لە ساڵی ١٨٣٠ز کەوتەوە دەست فەرەنسیەکان. لەو ماوەیەدا تا ساڵی ١٩٢٠ز بە دەیان راپەرین و شۆرش کرا بە پێی هەندێ ئامار گەیشتە (١٦٠) راپەرین. لە سەرەتاکانی ١٩٥٤ز شۆرشی جەزائیر دەستی پێکرد. بەسەرکردایەتی (بەرەی رزگاری نیشتمانی جەزائیر) بەو دروشمە (دروست کردنی دەولەتیجەزائیری سەربەخۆوبە ناوەرۆکێکی دیموکراتی سۆشیالیستی لەچوارچێوەی مەبادیئەکانی ئیسلامی) کە لە بەیانی نوفیمبر ١٩٥٤هاتبوو، لە ١٥یولیو١٩٦٢ بە پێی پەیمان نامەی (ئیڤان) سەربەخۆی خۆی وەرگرت وبوو بە ئەندامێك لەجامیعەی عەرەبی، بن بلا بووە سەرۆك، بەرەو سوشیالستی وشیوعیەت بەریوەبوو،ئینجا دوای (٣)ساڵ١٩٦٥ئینقلابێك لەلایەن (بۆمیدیەن)کرا تا ساڵی ١٩٨٠ بەنەخۆشیەکی سەخت مرد،(شاذلی بن جدید) سەرۆکایەتی وولاتیان وەرگرت لە ٢٣-٢-١٩٨٩دەستکاری دەستور کراو سوشیالستی لێفرێدرا تا هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٠لە دوایدا کە شاذلی بن جدید لێ خستراو عەسکەر هاتنە سەر حوکم کە هەتا ئێستا(٣) سەرۆکیان گۆریوە، شایانی باسە هاواری بومدیەن یەکێ لەو سێکەسەیە(شاە +صدام+بۆمیدیەن)کە رێکەوتنی جەزائریان مۆر کرد لە ساڵی ١٩٧٥لە سەرتێك رووخانی شۆرشی کوردوهەرسێکیان لە سەردونیا ریسوابوون،دوانیان بە هیلاك چوون ئەوی تریشیان سەری ئەوەندە شۆر بووهەموو رۆژێك جارەك دەمرێ.

**بەشی یەکەم**

# کۆتایی سەدەی بیستەم
# بێداری ئیسلامی لە جیهاندا

لە قورئاندا باسی ڕووداوەکانی مێژوو دەکات وەك تاکە ڕاسترین سەرچاوە، هەر لە بانگی نێرراوەکانی خوای گەورە تا شۆرشەکانی دژ بە زۆرداران بە ڕوونی دەردەکەوێ کە ڕاکێشانی خەڵك بۆ مەبدەئێکی ڕاست زۆر بە زەحمەت بووە، نموونەی حەزرەتی نوحﷺ کە (٩٥٠) ساڵ بانگی خەڵکی کردووە. کەچی بەدەنگ هاتووەکانی نەگەیشتۆتە (١٠٠) کەس، وە بۆ ماوەی (٣) ساڵ پێغەمبەرﷺ تەنها توانی (١١)کەس کەسب بکات، نموومەیتریش زۆرە،هەرچەندە بە پەیامی ڕاستەوخۆش ئیشیان کردووە. کەچی ئێستا دەبینین بێداری ئیسلامی لە ماوەیەکی کورت وا بە خێرایی سەرتاسەری جیهان تەنیەوە و هیچ کلۆجێك ناماوە ئێستا بانگی ئیسلامی و بزووتنەوەی ئیسلامی لێ نەدرەوشێتەوە لە کاتیکا هەریەکە لە مدرسەکانی تری شیوعیەت (کە وولاتی زلهێزی وەکو سۆڤیەت و چینی لە پشت بووە) و مدرسەی سەرمایەداریش (ئەمریکا و بریطانیا) و مدرسەی سوشیال دیموکراتەکان (نیوەی ئەورپای لەگەڵدا) بوو، هەر بەرەنگاری ئیسلامیان پێ نەکرا، وا هاتە مەیدان وەك تاکە بەدیلێك بۆ سەرجەم کۆمەڵ، جا با بزانین ئەو هۆیانە چی بوون کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ئیسلام بەو خێراییە؟ دیارە دەبێت زۆر بە کورتی بەسەریانا تێپەڕین:

## ١- ڕەوتی زانستی:

زانستەکانی بەشەریەت وا باو بوو کە دژی ئاینە و لە قازانجی فلسفەی مادیە لە ڕاستیشدا هەریەکە لە زانستەکانی فیزیای کلاسیکی و گەردوون وکیمیا و بایولوجی....تا نیوەی ئەو سەدەیەش پاڵپشتێکی بەهێزی بۆچوونی مادی بوو،ئەوەتا کتابە گەورەکان وەك (نظام الطبيعة-هۆلباخ)، (مجتمع القديم-مورگان)، (اصل الأنواع- داروين)، (فلسفة ماركس).. هەموو ئەوانە بە پالپشتی زانستی کۆن بنیات نرا. کەچی لەو دواییە ڕەوتی زانست گۆرا تا گەیشتە ئەو رادەیە ئێستا بوو بە بناغەیەکی ڕاستیەکانی قورئان و بوو بە بەشێك لە دەعوای ئیسلامی، ئەو شۆرشە زانستیە گەورەیە کە کاری کردە سەر سرو باوەری ئادەمی زادئەوە بوو کە ساغ بۆوە کە ئەو گەردوونە تەمەنی هەیە، سنووری هەیە ئەجەلیشی هەیە،کە پێی دەڵێن (گەردوونی فراوانبوو) هەموو بۆچونەکانی ماددی ژێراو ژوور کرد کە پێش تر بنیات نرا بوو لە سەر گەردوونێك گوایە هەر هەبووە وهەر دەشمینی وسنووریشی نیە کە پێی دەڵێن (گەردوونی وەستاو)ئەو تیۆرە لە (بطليموس) لە پ.ز حوکمی هەبوو تا نیوەی ئەو

سەدەیە.. دیارە هەموو تیۆرە تەئوریەکان جا چ ماددە بێت یان ژیان دەشێت لە ئەنجامی گۆڕان و کارلێکردنی ماددە لەبۆ هەتاهەتایە شتێکی لێ پەیدا بێت، لەسەر ئەو بنچینەیە هەموو بۆچوونە ئیلحادیەکان وەك مارکسی-داروینی- دورکایمی-وجودی...لێ پەیدا دەبێت. بۆ نموونە دەرفەتی ڕێزبوونی ترشەلۆکەکانی خانە کە ژمارەیان (٥٢)لە دەکا = $10^{84}$ کە بە ملیاران جار لە ژمارەی هەموو ئەتۆم و ئەوەندەش هێندەی تەمەنی گەردوونە کە یەکجار زۆرە، بەڵام لە گەردوونی بێ‌تەمەن موستەحیل نی‌یە (بۆ جەدەلیش بێت) کاتێ دۆزرایەوە کە گەردوون تەمەنی هەیە ئەو مەجالانە نەماو بیری ئادەمیزادی هەژان و بەخەبەری هێنایەوە، بەو شێوەیە قاچێکی ماددی لەبنڕا قرتێنرا، قاچی دووەمی کە بریتی بوو لە تێڕوانینی ماددیانەی زانست بۆ ئەو جیهانە وەك (ماددەی نەمر) کە لە بنچینەدا لە یاسای پاراستنی ماددە هاتبوو لە کیمیا لەلایەن (لافوازیە) کە دەڵێت: (ماددە لەناو ناچێت و ناشبێت)... هەموو شتێك دەگۆڕێت لە دۆخێك بۆ دۆخێکی تر بەڵام هەر ماددەیە، بەو شێوەیە باڵی ماددی لە فلسفە تا سەدەی بیستەم زۆر زاڵ بوو، تا لە زانستی نوێدا دەرکەوت کە ماددەش نەمر نی‌یە دوای ئەوەی (ماددەی دژ) دۆزرایەوە لە کیمیا و لە گەردوونیش (ئەستێرە ڕەشەکان) دۆزرانەوە، بەو شێوەیە ئەو یاسایە بەیاسای نەماو گۆڕاو قاچی دووەمی مدرسەی ماددی لەدەست دراو بیری ئادەمیزادی نوێ کەوتە گەڕان بە دوای بەدیلێکی نامادی، بەو شێوەیە زانستەکان هاتن و ڕاستی‌یەکانی قورئانیان سەلماند بە شێوەیەك هەر دۆزینەوەیەك وەك (ڕادان بۆت) گوتەنی: (دێرە شیعرێکە بەسەر خودای گەورە)، هەروەها ووتەبە نرخەکەی سید قطب هاتەدی کە دەڵێت: (قورئان کتابی خوای خوێندراوەیە و گەردوونیش کتابی خوای بینراوە)، ئێستا ڕەوتی زانست وایە کە دەستکەوتی زانست ڕاستەوخۆ لە خزمەتی بێداری ئیسلامیە و بەشێکە لە بانگەوازەکەی بۆ ناو ڕەوشەنبیر و بیرتیژان کە بە دەیان زانای غەربی و شەرقی بەهۆی یەك ئایەت ئیسلام بوونە، هەموو ئایەتەکش موعجیزەیە، ئەوڕۆنا سبەی بەدیار دەکەوێ دیارە ئەقلی زۆر پەرە سەندووە و یاساکانی سروشت و شەریعەتی ئیسلام یەکتر پا سادان دەکەن.

## ٢-ڕەوتی فکری بە گشتی:

فیکری ئادەمیزاد لە رووی (فلسفی) و زانستی و سیاسی زۆر بە قووڵی گۆڕا، ئەوەی زۆر چەسپاو پیرۆز بوو دەرکەوت هەڵەیە، ئەوەی لەسەروو باسمان کرد لایەنی زانستی بوو لایەنی فلسەفی و سیاسی کە بە هەموویان ئایدلۆژیای ئادەمیزاد پێك دەهێنن وا دروست بووە کە ئایین بەگشتی و ئاینی ئیسلامیش هەر تەنیا کۆمەڵە ئامۆژگاریەکە بۆ سەردەمێك ئیدی ڕەت بوو نایەتەوە جارێکی تر، ئێستا وەك کۆسپ لە پێش پێشکەوتن دایە. پرسیاری بنچینەیی لە فلسەفەدا ئەوە بوو کە ئایا هۆشیاری لە پێش ماددەیە یان بە پێچەوانە و بەگوێرەی وەڵامی ئەو پرسیارە هەر کەسەو هەر تەوژمێکیان دابەش دەکرد بۆ میثالی بەشەکەی تریش بۆ ماددی ئیسلام میثالی و سەرمایەداری

و....هەمووی تێکەڵە کرا بوو... خیتابی مارکیسیەت بۆ سەر فکری ئادەمیزاد زۆر زاڵ بوو. (**أضعف الإیمان**) دەبووایە سۆشیالیستی بێت لە هەموو شتێك، بێسوشیالیستی دەوڵەتیش نە دەبوو بویە هەر لە جەزائیر کۆمەڵەی زانایانی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٦٢ هەڵوەشێنرایەوە، شێخ بەشیر ئیبراهیمی دوور خرایەوە تا وەفاتی کرد، هیچ وولاتێك نەبوو سوشیالیستی نەبێت، ئەگینا ئەمریکی بوو. ئەو خیتابە نەك هەر لەسەر فلسەفە و سیاسەت بەڵکو دەستی بەسەر شیعر و هونەر و چیرۆك و نووسین بەگشتی داگرتبوو... بەڵام ئێستا وەزع گۆڕا رەوتی فکری گۆڕا، ئەو بۆچوونانە ئێستا کەوتە پاش مەگەر لە کوردستان کەمێك مابێت کە بە درەنگەوە شتی پێ دەگات سەرنج بدە ئەو رۆژنامەی (یەکسانی) کە ئێستا لێرە گەرمەیەتی لەناو کۆمەنیستەکان ئەوە کت وەت لەچاو کردنەوەی رۆژنامەیە کە پێش (١٠٦) ساڵ لە ئەڵمانیا دەردەچوو لەلایەن کۆمەڵێك ئافرەتی شیوعیەوە لە ساڵی ١٨٩١ بەناوی (گلانخاید) بە ئەڵمانی واتە (یەکسانی)، ئەوەیە قەیرانی راستەقینەی رۆشەنبیری کورد لەچاو کردنەوەیەکی یەك سەدە لەمەو پێش...ئەوەیە بەجێمان و تەخەلف. هەر چەندە لێرەش گۆڕانکاریەکی زۆر بووە وا زۆریش بە رێوەیە، باشترین بەڵگەش کاتێ ماموستا شارەزووری (خ.ر ) کتێبی (رێکەوت لە تەرازووی ژێریدا) دەرکرد، ساڵی ١٩٧٧ زیاتر لە (٣٠٠) ووتار دژی نوسرا کەچی ئێستا ئەگەر ووتارێکی عەلمانیانە بنوسرێ رەنگە (١٠٠) ووتاری ئیسلامی دژی بنوسرێ کە باشترین بەڵگەیە لە کوردستانیش رەوتی فکر بەرە و ئیسلامیە. ئیدی مدرسەی مارکسیزم، تیۆری داروین، تیۆری جنسی فرۆید، تێروانینەکانی دورکایم... هەمووی شکستی خوارد، هیچ بەشێکی مارکس ئەصڵ و ئەساسی نەما؛ نەتێروانینە مادیەکەی نەتێروانینە مێژوویەکەی و نەبنچینە ئابووریەکەی.... تیۆری سیاسەکەی پارکتیلەکانی هەر هەمووی شکستی خوارد وەك لە سێهەم هۆ باسی دەکەین.

## ٢- شکستی شیوعیەت وەك سیستەمی کۆمەڵایەتی:

دیارە هەموو لایەك کۆکن کە سەرمایەداری نەخۆشییە، جا بۆ چارەسەری و بەدیل چەندین مدرسە هاتە کایەوە لەوانەش شیوعیەت بوو، کە وەك تیۆرو پاراکتیك وەك رێبازی کۆمەڵاتی و تیۆری سیاسی بەو سێوەیە سەربازگەیەکی لە جیهان پێك هێنا کە لە زهنی کەس نەبوو بەو زووانە شکست بێنی، کەچی بەو شێوەی بینیمان وەك مدرسە وەك فکرو وەك رێبازی کۆمەڵایەتی وەك (تیۆر و پاراکتیك) رووخاو لە تاقیکردنەوە دەرنەچوو، بە کورتی لەبەر ئەو هۆیانە:

أ- پێش هەموو شتێك رووبەرووی زانستی نوێ بۆوەن وەك لەوەو پێش بەگشتی باسمان کرد بەڵام دەتوانین نموونەیەکی زەق بهێنین لە (عرض موجز لمادة الدیالیکتك) ص٥، لە ژێر ناونیشانێکی گەورەدا دەڵێت: (لا نهایة لعالم بوحدته)، کە روونە پشتی بەستووە بە (گەردوونی بێتەمەن) کەچی ئەو بۆچوونە گەردوونە لە زانست شکستی هێنا کە بناغەی هەموو سەرخانەکانی فکری مارکسیە..

ب- له رووی فهلسفهی/ ئهو پرسیارانهی که خرا بووه پێش فهلسفهی مارکسیزم ههر لێی زیاد دهبوو بێ وهلام، هیچ بهشێکی نهما وهك یاسا چ له سروشت چ له ژیان چ له کۆمهل. ههر بۆ نموونه ههتا ئێستاش که (تناقض) (کرۆکی دیالیکتیکه وه لینین گوتهنی)، کهچی یهك نموونهیان پێ نهدۆزراوه لهو سروشته بهو مواصفاتهی خۆیان، ئینجا ئهو پرسیاره گوایه بنچینهی فهلسفه ئاخۆ (وعی)له پێش ماددهیه یان به پێچهوانه و گوایه ئهو چهند ریانی ریبازی فهلسهفهی دهرنهچوو ئێستا پرسیاری بنچینهیی ئه وهیه ئاخۆ ئهو جیهانه به عهیارو مهبهست بووه ب جۆرهمهکی و لهسهر ئه و وهلامه دابهش دهبن... بۆیه ههر دۆزینهوهیهکی زانستی له قورئانی ئیسلامه... ههر بۆیهش تطوری فکری ئادهمیزاد بهرهو بهندهکانی شهریعهتی ئیسلامی دهروِن که لووتکهی ئامانجی و ئهنجامی تطوری فکره، بهو شێوهیه بهشه ههره زۆری فلسفهی مارکسیزم تێك رووخا.

ج-له ئهرزی واقعیشدا شێوازی ژیانی سوشیالیستهکان و شیوعیهکان سهرکهوتوو نهبوو، تووشی ئابوری و پیشهسازیهکی پاشکهوتوو هاتن.

د- تیۆری پهرهسهندنیش شکستی هێنا و لهجێی ئهو (ئهندازهی جینهکان) دۆزرایهوه که تیایدا سهلمێندرا که چۆن (تطور) له سروشتدا نیه ئاواش له ژیانیشدا نیه تهنها له کۆمهلدا ههیه بهشێوهیهك جیا لهو شێوهیهی مارکسیزم.

ه- دابهش بوونی شیوعیهت بۆ رێبازی جیا به حوکمی ئهمری واقع، نهشدهگونجا لهگهل خصوصیاتی هیچ میللهتێك، ههندێکیان ئهوپهری دیکتاتۆر و ههندێکیش دیموکراتی...بهکورتی ههموو شێوازیکیان تاقی کردهوه ، رێگای شۆرشگیری وهك ئێستای حزبی کۆمهنیستی کرێکاری عێراق لهسهری دهروا، رێگای (تعایشی سلمی) و بهشداری له پهرلهمان شێوازهدیمکراتیهکان له ئهوروپا کراَ بهو کۆمهله شیوعیهیان دهووت (ئۆرۆ شیوعیه) وهك ئێستا حزبه شیوعیهکانی کوردستان و عێراق لهسهری دهرۆن،... بهو شێوه ئهوهی ئێستا له کوردستان شیوعیهکان تاقیدهکهنهوه ئهوه (تاقی کرایهوه) پێش (٢٠-٣٠)سال ههموو ئهو رێبازانه پشکنراون و ئینجا شکستیان هێنا، ههندێ راو بۆچوونی مارکسیهکانی ئێره دهلێن شیوعیهت له ئهنجامی برسیهتی بهرپا دهبێت که (نظریة بؤس المتزايد)ی مارکس پێش بینی کردووه، ئهو برسیهتیش نههات، بهلام ئهو برسیهتیهش هات له صۆمال و زۆر شوێنی ئهفریقیا کهچی لهو تاقیکردنهوه تالهش نههاتهدی مهگهر مهبهستی ئهو برادهرانه ئهوه بێت ئهوهنده برسی بن ههتا مردن ئینجا لهپاش مردن شیوعیهت بێته دی!!

و- پهیدابوونی بزووتنهوهی کرێکاری و ناکۆکی ناوهخۆی وهستانی فکری و پێشکهوتن.

ر- پیاده کردنی شیوعیهت:- ئهوهی زۆر گرنگه مارکسیهت باوهری به ئهخلاقی چهسپاو نیه، له کاتیکا له شیوعیهتیش نهیاسا و نهپۆلیس و نهخێزان و نهدهولهت هیچ نامێنێ، جا نازانین کێ

پاریزگاری لەو سیستەمە دەکات لەکاتێکا ئەگەر شیوعیەتیش بهاتبایەدی، چونکە تەنها دوو پالەر ئادەمیزادراست دەکاتەوە کە ئیلتزامی هەبێت:

١- ئەخلاقی پلەبەرز، ٢- بەیاسایەکی تۆند تۆلّ کە دەولّەت پاریزگاری بکات، کەچی خالی دووەم نامێنێت و مارکسیەتیش هیچ پەروەردەیەکی نەبوو بۆ بیناکردنی ئەخلاقی ئادەمیزادکە خوی هەست بە بەرپرسیارەتی بکات و سیستەمی شیوعیەت بپارێزن، دیارە ئەو ئەخلاقەش هەرگیز لە ئایین جیاناکرێتەوە کە مارکس پێی وابوو (ئەفیون الشعوب)ـە، بۆیە بینمان نەك شیوعیەت سوشیالیسیش جێبەجێ نەکراو بەرهەمی سەربازگەی سوشیالیست لە پیشەسازی و کشتوکالّی جۆرەکەی (تەرزەکەی-نوعەکەی)زۆر خراپ بوو لەچاو سەرمایەداری، بەو شێوە شیوعیەت نەهاتە دی لەبەر ئەوناکۆکیە گەورەیەی لە نێوان واقع و تیۆریدا.. دووبارە هەموو تیۆرە ئەنثرۆپولوجی وکۆمەلایەتی و سیاسیەکان بەگشتی هاتنەوە سەر تێروانینی بنچینەی ئیسلام بۆ ئادەمیزاد کە کە جەوهەری مشکلەکەی ئەخلاقە (...بعثت لأتمم مكارم الأخلاق).

بەو شێوەیە شکستی شیوعیەت وەك مەدرسەی فکری و رێبازی سیاسی بۆشاییەکی گەورەی لە جیهاندا پەیدا کرد و ئاسۆیەکی فراوانی بۆ بێداری ئیسلام هێنا پێش، بەشێوەیەك کە قەیرانێکی سیاسی گەورەشی بۆتێکرای عەلمانیەت دروست کرد، هەرچی حزبی سیاسی هەیە بەتایبەتی لە ولاتانی جیهانی سێیەم لە کوردستانی خۆشماندا ئنتمای حزبی گەرایەوە سەر بنچینەی بەرژەوەندی، واتە عەقیدەی ئەو حزبە عەلمانیانە ئەوەندە بەهێز نەبوو ئەو ئەندام و لایەنگرانە پێ پەروەردە بکەن کە نەفەری وا دروست بکەن عەقیدەی بەهێزتر بێت لە بەرژەوەندی شخص... بێجگە لە ئیسلامیەکان هەموو مدرسەو لایەنە سیاسیەکان لەو قەیرانە ئالاون و نەجاتیان نیە، تەنیا عەقیدەی ئیسلامە خەلّکی پێدروست دەبێت کە نەك بەرژەوەندیەکانی بەلّکو سەروومالیشی لەپێناو ئیسلامدا بکاتە قوربانی تموونەی کۆن زۆرە و ئێنوێش ئەوەتا هەرچی جولانەوەی بەرهەلّستکاری چەکداریە تەنها بە ئیسلامیەکان دەکرێ ئەوەتا جەزائیر، چیچان، فلیپین، بەرەی کشمیر، بۆسنە، طاجیکستان، لبنان، فلسطین،...زۆر شوێنی تر، ئەوەتا چالاکیەکانی فلسطین باشترین نموونەن، ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگە و هەر ئەوەشە بوویتە هۆی کزبوونی لایەنە عەلمانیەکان و گەشەسەندێکی بە خێرایی تێکرای بزوتنە ئیسلامیەکان لەهەر شوێنێك مەجالی دروست بوون بێت.

٤-لەهۆیە هەرە گرنگەکانی بێداری ئیسلامی بەو خێراییە دەگەرێتەوە بۆ سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی لە ئێران، کە کۆمەلێك تایبەتمەندی هەبوو جیا لەهەموو شۆرشێك بەو شێوەیە:

أ- بەشێوەیەکی شارستانی و زانستیانە شورشەکە دەستی پێکرد بەتوندی دووپاتی کردەوە کە مىللەت بەهێزترە لە تکنەلۆجیای سەردەم. ئەو بوچونەی پوچەل کردەوە کە شورش ناکرێ دژی تکنەلۆجیای نیست

ب-بەڕاستی شۆڕشی ئێران شۆڕش بوو پڕ بەمانای خۆی نەک لە تاریکی شەو چەند دەبابە ـك هێـ بکاتە سەر کۆشکی پاشا و بیروخێنی و خەڵك نەزانی چ باسە و کێ هاتـ سەر حوکم ـەڵدر ـەمور خەڵکی ئێران (١٨) مانگ بە خوێن دژی ئاسن شۆڕش کراو گەورەترین ریفرو ـ ەو لە ـ زۆر...

ج-سەرکەوتنی ئەو تاقیکردنەوە وەك دەوڵەتیکی ئیسلامی لەکۆتایی سەدەی بیستەم نەرۆژئاو، نەرۆژهەڵات مانایەکی یەکجار گەورەی فکری،کۆمەڵایەتی،سایکلوجی.سەربەری.هەتا فەلسـ ـی بەخشی.

د-سەلماندی کە تاکە رێبازێکە ئایدیالی (میسالی) نیە بدیلی سەرمایەداریشە کەچی دەرئەوت شیوعیەتیش وەك یۆتوپیەکان هەر خەیاڵ بوو.

هـ-زۆر گفتوگۆی فکری ساغ کردەوە وەك زیندوی ئیسلام،سیاسەت وئایین،ئیسلام نەسەرمایەدارییە نەسوشیالستی،....زۆریتر. ئەو تەوژمە تا ئێستا بەگور بەرێوەیە لەگەڵ بەرگریە لەلایەنزۆردارانی جیهان، کە شۆڕشی ئەفغانستانی بەدواداهات وەك چۆن لە ئیران گەورەترین قەلای سەرمایەداراری‌رووخاناواش گەورەترین سوپایی شیوعی لەو بەهۆی ئەو عەقیدە تێك شکاند..

ئێستا رۆژبەرۆژ بێداری بەرەو پێشە و تاقی کردنەوەی شیشانی سەلماندی کە جولانەوەی رزگاری‌خوازی نیشتیمانیش لەوسەردەمەدا تەنها بەئیسلام رزگاری دەبێت، واتە ئیسلام لە رزگاری کۆمەلایەتی‌یەوە پەرێوە بۆ رزگاری نیشتمانی وا بەرێوەیە بۆ بەشەکانی تریش.

## ئیفلاسی حیزبە کلاسیکیەکان

٥- هۆیەکانی تری کۆمەلایەتی و سیاسی یەکجار زۆریش هاتە کایەوە بۆ یارمەتی دانی بێداری ئیسلامی لەکاتێکا ئەو حزبانەی رادیکالی لەناو وولاتانی ئیسلامی بەگشتی بەڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لەژێر کاریگەری فکری مارکسیەت بوون، بۆیە شکستی ئەو حزبانە زۆر پاشەکشەیان کرد تا ئەو رادەیە کۆگاکانی فکریان چکی کرد، لە بواری سیاسیدا توانای بەرگریشیان نەما خۆیان بەدەست دەسەلاتداراندا، ئینجا ئەو گۆڕانکاریانە لە جیهان هاتە کایەوە و یەك جوولانەوەی میللی دەستی پێکرد لەسەرەتای ١٩٨٩-١٩٩٠ سەری وولاتانی شیوعیەتی خواردوو یەکێتی سوڤیەت هەلوەشایەوە و دیواری بەرلین رووخاو نەخشەی سیاسی جیهان زۆر گۆرا. خوپیشاندانەکانی خوێندکارانی وولاتی چین لە گۆرەپانی (تیان مینین)، ئەوەی ماوەش وەك کۆریا و ڤێتنام و کوبا کە ئێستاش لە تارکستانی دکتاتۆری شیوعیەت ماو ـ وەك دەروونناسی دەریش کەوت ئەو سەرۆکانەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریان گرتووە بو (دیکتا ـ ریە)کەـە ـە لەچاو سیسکو، ئەریش هۆنگیر چیڤگۆڤ ـدووپاتی دەکەن کە دکتاتورن و ـ ـس، ئە ـ (کید ـ ـس سۆنگ) سەروکی

کۆرپای سەروو وەك مونەزیریکی شیوعی ئەو سەردەم بوو لەسەرە مەرگیدا وەسیەتی کرد نورەنەی ببێتە سەرۆك. وەك پادشایی ئێستا وا سەرۆکە، بەو شیوەیە کاریکردە سەر هەموو عەلمانەت، هەر بۆیەش تەیاری نەتەوایەتی بەگشتی و عەرەبی بەتایبەتی لەو سەرووبەرە گەیشتنە ئەو کۆبرموەریە، بێ ستراتیجیەت دەستی بڵند کرد لە ڕاست داگیرکەران، لە کاتێکا میصر لە جامعەی عەرەبی دەرکرا، چونکی رێکەوتنی (کامپ دیڤد)ی یەکلایانەی لەگەڵ ئیسرائیل مۆرکرد، لەساڵی ١٩٧٩، کەچی دوای هەموو چوونەوە ریزی ئەو. عێراق کوێتی داگیر کرد بە پشتوانی ئەمریکا لی‌یان ستاندەوە، عێراق سەری بۆ هەموو داواکانی ئەمریکا شۆر کرد، شارەزایان دەڵێن لە مێژووی رێکەوتنان و رەزامەندی عێراق لەسەری ئەوەندە سەرشۆری تێدا نەبووە، هەتا (معمر قذافي) خۆی پی‌نەگیرا سەرزەنشتی صدامی کرد و بە ترسنۆکی ناوی برد، لە کۆنگرەی عەرەبی لە عەممان لە دووری چەند کیلۆمەتریك لە قەوارەی جوولەکە، کە لەساڵی ١٩٨٧ کرا کەچی بەزۆریەی دەنگ لەم کۆنگرەیە ئێران بە مەترسی دانرا، نەك جوولەکە (ئیسرائیل)، ئێستا کێشەی فلسطين بچووك بۆوە لە قەیرانێکی جیهانی و ئیسلامی بۆ نێوان یاسر عەرەفات و موخابەراتی ئیسرائیلی، وەك کێشەیەکی ناوخۆیی، بە هەموو وولاتانی عەرەب بە ئەندازەی (جیهاد وحەماس و حزب الله) کاریان لەسەر ئیسرائیل نیە کە دەوڵەتیش نین نوێنەرایەتی تەیاری ئیسلامی عەرەبی دەکەن، جا ئەگەر دەوڵەت بوونایە چۆن دەبوو، تیاری عەرەبی ئێستا ئەمریکا دەم ڕاستیانە کەچی ئەمریکا لەساڵی ١٩٩٦ سی‌جار ڤیتۆی بەکار هێنا هەر سی یەك دژی عەرەب، ئێستا بۆ ئیسرائیل حەلالە هەر چی چەکێکی کوشندەی هەبێت بەڵام بۆ عەرەب و ئیسلامیەکان قەدەغەیە، ئەوەتا بۆ پاکستان ئەمریکا نیگەرانە کە چەکی ئەوەوی هەبێت، کەچی هندستان هەیەتی هیچ باس نیە، ئێستا ئەمریکا ئامادەیە تەکنیکی پیویست بۆ گەشە ساندنی ئەوەوی چین بدا بەرامبەر بەوەی چین هاوکاری ئێران نەکا بۆ بنیاتنانی (مفاعل نووي) بۆ ئیسرائیل هەیە (أبو جهاد) لە تونس بکوژێ و (فتحي شقاقي) لە مالتا، لێدانی مفاعل ئەوەوی عێراق، لێدانی لبنان،.... هەموو ئەوانە ئیرهاب نیە کەچی بەرگری لەخاك و وولات بۆ عەرەب و ئیسلامی‌یەکان ئیرهابە...کەچی پرس و ڕای تیاری عەرەب بە ئەمریکایە....رێك ئەم قسە و باسە هاتنەدی قسەی ئیمامی عەلیە کە دەفەرمووێ: (ڕاویژ بە دوژمن سەر شۆریە).

بەشی دووەم

## سەربردەی بەرەی ئینقاذی ئیسلامی جەزائیری

هەموو ئەوروپا و ئەمریکا لەبەرەی پێشەوا بە ئێران خەریك بوون کە ئەو بێداریە نەپەرتەوە ئاسیاو ئەفریقیا، لەناکاودا لەسەرووی ئەفریقیا لە پشت ئەو بەرمیە دەنگێکی بەتین بەرز بۆوە (لا اله الا الله) کە هەموو جیهانی هەژاند، لە شوێنێك کە بە فەرەنسای ئەفریقیا دەژمێردرا. هەموو شیوعیەکانی دونیا چاوەڕێ بوون لەناو وولاتانی عەرەب، جەزائیر بەرەو سۆشیالیستی زانستی و شیوعیە بڕوا، دوایش لەڕۆژئاواش لەوێ چاوەڕێی تاقیکردنەوەی دیموکراتی بوون، کە ڕژێمێکی شێوە ئەوروپی لێ پەیدا بێت، کەچی ئەو دیموکراتیە ئیسلامی لێ‌پەیدا بوو، بە شێوەیەك کە سەرکەوتنێکی داستانی بوو لە ٨٦٪ دەنگیان بەدەست هێنا لە کاتێکا کە (پرۆفسۆر عباس مدنی) لە زیندان بوو، بەو شێوەیە هەموو زۆردارانی دونیا بە ووریەو درشتەوە، لە ئیقلیمی و جیهاندا قۆراخ بوون لە خۆیان ترسان، ئەمریکا سەرقاڵ بوو بە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست لێی پەڕیەوە ئەفریقیا تا لەوێ بەئاگا هات پەڕیەوە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو پاشان بۆ مالیزیاو ئەندنوسیا... تا لەناو ئەمریکاش بزووتنەوەی ئیسلامی پەیدا بوو، بۆیە هەموو زانا و مونەزیر و لێکۆڵەرەوەکانی ئەمریکا کۆبوونەوە و زەنگی مەترسیان بۆ سەرمایەداری لێداو لە لێدوانێکی بەناو بانگ ووتیان: (ئەگەر شیوعیەت مەترسی بوو بۆ ئێمە ئەوا ئیسلام گەلێ ترسناکترە، چونکە شیوعیەت تەنیا بە ماددیانە دژایەتی دەکردین بەڵام ئیسلام بە ماددە و روح).

## هەڵ و مەرجی نێو دەوڵەتی لە سەروبەری پەیدابوونی بەرەی ئینقاذ

لەجیهاندا ولاتە شوعیەکان دەغەڵ ببون لە رووی کۆمەڵایەتی، قەڵۆش ببون لە ڕوی فیکری، لە گۆڕنپانی نێو دەوڵەتی لە ساڵانی ١٩٨٠ بزووتنەوەیەکی کرێکاری لەپۆڵندا پەیدا بوو بە ناوی (سەندیکای کرێکاری) بە سەرکردایەتی (لێخ ڤاونسا) یەکەم داواکاریان نەمانی شیوعیەت بوو...سەرنج بدە لە پۆڵندا (جەنەراڵ یارۆلنرسکی) سکرتێری حزبی شیوعی بوو وولاتێکی دیکتاتۆری پرۆلیتاری بوو واتە حوکم بە حیساب حوکمی کرێکاران بوو کە چی ئەو کرێکارانە لێیان هەڵسان (نەك بۆرجوازیەکان) کە هەڵوێستی هەموو شیوعیەکانی جیهانی ئاوەژوو کردەوەو بووە سەرەتایەك بۆ شۆڕشێکی سەرتاسەری دژی شیوعیەت، بەو شێوەیە (لینغ ڤاوس) ناوی لە مێژوو بە یەکێ لە تێکدەرانی شیوعیەت دادەنرێ لە دنیای ئاوەدا، وا دیار بوو لە هەموو وولاتانی شیوعیەت

قەیرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و باری نەفسی و دەروونی قوول ڕووی تێکردبوون، بەڵام لە ترسی سۆڤیەتی قامچی لەدەست بووکەوەختی خۆی جولانەوەی وا سەدیین لە ساڵی ١٩٤٦ کە بە (ربیع پراگ) بەناوبانگەسەرکووتی کردنەوە. لەو سەرو بەرەدا چوار سەرۆکی سۆڤیەت گۆڕا (لیونید بریجنیف) لە ساڵی ١٩٨٠ مرد (قستنطین چارنیکۆ) هات و ساڵیکی نەبرد ئەویش مرد (یوری ئەندرۆپۆف) هات و ئەویش مرد نۆبەتی پیاوێکی بە سەرنج و دنیا گۆڕ هات بەناوی (گۆرباتشۆف) کە هات بە هۆی هەردوو پرانسیپی (بیرۆسترۆیکاو گلاستۆست) دەستی بەگۆڕانکاری کرد شیوعیەکان هەمووی لەکۆنگرە لایەنگیریانکردوو ووتیان ئەوا سەرقەپاغی مەنجەڵکی هەڵدایەوە پێش تەقین، دوایی هەر تەقیویەك لەدوای یەك جەماوەری وولاتانی شیوعی هەڵسان بەتایبەتی کرێکاران، یەکێتی سۆڤێتیش لە بار یەك هەڵوەشایەوە ...بەو شێوەیە باری نێو دەوڵەتی زۆر بە قووڵی گۆڕا هەموو حزبە شیوعیەکان گۆڕان بۆحزبی دیموکراتی کۆمەڵایەتی، یان سۆشیالستی کە پێشتر ئەو جۆرە دیموکراتیە وسۆشیالیستیە بەروویەك لەرووەکانی برجوازی دەژمێردرا لەلایەن شیوعیەتەوە،بەو شێوەیە حزبەشیوعیەکان وسۆشیالست مارکسیەکان بەگشتی لەرووی فکرو بنکەی جەماوەریەوە قەڵۆش بوون،هەتا گەیشتە خۆبەدەستەوەدان، زیاتر لەوە زۆر بەئاشکرا لەرووپەری ڕۆژنامە باس لەشکستی فکر بە تێکرا کرا لەکوردستانی خۆشماندا هەمان بۆچوون پەیدابوو لە (ڕێبازی نوێ)ی(ی.ن.ك) بە پێنوسی (بەرپرسی سەنتەر) دەڵێت: بەکەوتنی شیوعیەت ئایدلۆجیایی بەشەریەت سقوطی کرد.

بەو شێوەیە چەپەکانی جەزائیریش تووشی بێ ئومێدی و خۆ بەدەستەوەدان بوون، هیچیان پێ نەماو بۆشایی گەورەیان لێ پەیدابوو زۆر بەخێرایی، ئەوە لەلای جەمسەری ڕۆژهەڵات هەرچی لەجەمسەری ڕۆژئاوەشە ڕژێمێکی نوێی جیهانی لەلایەن (جۆرج بوش)ەوە لەساڵی ١٩٩٠جاردرا کەگوایە مافی مرۆڤ وئازادی پێشەنگی ئەو ڕژێمەیە دەبێت بەڵام زۆر بەزووی (بانێك و دووهەوال الکیل بالمیکالین)ی لی پەدی کرا هەتالەبیری سادەشدا، جۆرج بۆش و جۆن مێجەر پێشوازی گەرمیان لە هەریەکە لە (سلمان رشدی)و(وتسلیمە نسرین) کرد کە چێ لەسەر (بیر) دادگای (رۆجێتە گارۆدی) کرا، ئینجا ئەوشەپۆلەی شیوعیەتەوە بەرەو سەرمایەداریەوە(واتە بەگ فایر)ئەوا جارێکی تر لەسەرمایەداریش دیسان گەرانەوەبۆ جێگرەکانی کلاسیکی شیوعی، لە هەڵبژاردنەکان ئێستا بەرووني دەردەکەوێ کە لەمەدرەسەکان لیبرال دیموکرات بۆ سوشیال دیموکرات- بۆشیوعیە کلاسێکیەکان زۆر بەخێرایی دەسۆڕێت، ئەوەش یەك تاکە تەفسیری هەیە کە کۆمەڵی سەرمایەداریش بە دوای بەدیلێکن. تا ئێستا پێی نەگەیشتون لەرووی ئیقلیمیەوە. تەیاری نەتەوایەتی عەرەب توشی شکستێکی گەورە هات لەلایەکەوە سەرچاوەی فکریەکەی لە دەریایی مارکسیەت هەڵدەهێنجا ئەویش چکی کرد، لەلایەکی تـرەوە تەیاری نەتەوایەتی بەگشتی ، عەرەب بەتایبەتی لەهەڵومەرجێکی زۆر بۆڕاو بوون وەك (عبدالناصر) قسەیەکی بەناوبانگی هەیە دەڵێ:(اتفق العرب على ان لا يتفقوا)، معمر قزافی یش هەموو کۆنگرە کانی سەرانی عەرەب بە(-١،سفر) داناوە واتە سفرەکە سەرکەوتووەکەیانە، (زۆر بە ئاشکرا ئیسرائیل چەکی ئەتۆمی هەیە کەچی بۆ عەرەب قەدەغەیە هەیان بێت)، لە کۆنگرەی ١٩٨٧

عەمان بەزۆربەی دەنگ سەرانی عەرەب ئێرانیان بە مەترسی یەکەم دانا نەك ئیسرائیل، ئێستا تەیاری نەتەوایەتی عەرەب بە سەرشۆڕترین نەتەوەن لە جیهاندا بەرامبەر داگیرکەرانیان، مەلیك حسین سەرۆکی لیژنەی رزگار کردنی قودس بو وکەچی لەگەڵ دوژمنی خوێنڕێژی عەرەب (منحام بێگن) بە نهێنی کۆبوونەومیان دەکرد، مەلیك حسین پادشای ئوردن ناوی لە لیستی موخابراتی ئەمریکایی دەرکەوت، صدام حسین کە بە پاڵەوانی نەتەوایەتی عەرەب بەناوبانگ بوو چەکی کیمیاوی بەرامبەر بەگەلانی وولاتی خۆی بەکارهێناو لە چار دەقیقەدا ٨٠٠٠نەفەری لە هەڵەبجە پیکا کە چی نەوێرا بەرامبەر بە هاوپەیمانان لەشەری کویت دا بە کاری بهێنێ ، لە تەیاری عەرەب وا بەناوبانگە کە نەخشەی هاوپەیمانان بەخێرایی دەگۆری ئەمرۆ (مجلس التعاون الخليجي)سبەی (دول المغرب تعاوني)لەکاتێکی تر (العرب المتقدمين) و (دول المواجهة) و...هەر هەمووی دێت وبێ ئامانج دەروات وهیچ سیقەیەك لەنێوانیان نیە،لەنێوان عیراق و کویت سەرەرای ئەوەی پێنج رێکەوتن هەبوو کە چی شەوێك لە ناکاو داگیری کرد..

ئەوە هەموو لەکاتێکا کە ئیسلامیەکان لەجیهاندا وەك تەیارێکی نوێی هەڵقولاو لەناو هەناو عەلمانیەتی ئەو سەردەمە،لە هەر شوێنێك کەمێك ئازادی ودیموکراتی هەبووبێت ئیسلام بەخێرایی گەشەی دەکرد وەك لە ئوردن، تورکیا، تونس، مصر، سودان، ئێران، فلسطین، لبنان...لەزۆر شوێنیتر. هەتا لەکوردستانیش بنکەی ئیسلامیزۆر گەشەی کرد. لە سەروبەرەشۆرشی ئەفغانستانیش بە ئیسلامیانە سەرکەوت و(نجیب الله)ش لێ کەوت، تێکرایی عەلمانیەت بەرەو قەلۆش بوو،هەر حزبەو تەنیا ئەو خەڵکەی لەگەڵ بوو وەك بەندایەتی کۆن هەر لەخزمەتی دەسەت وپێوەندەکانی سەرۆکەکان بوو، هیچ پرانسیپێك نەبوو لەسەری برۆن، جارێك شیوعیەت وجارێك سوشیالستی وئینجا دیموکراتی و لیبرال ـ دیموکراتی وسوشیال دیموکراتی و ئەو جارەیان نەتەوایەتی... بەڵام ئەو شێوە جیا جیایانە هەر هەمووی ماهیەتەکەیان هاوبەش بوو کە خۆ دەوڵەمەند کردن بۆسەرۆکەکان و بەرژەوەندی تەسکی گەورەکانیان بوو کە لەجەزائیر زیاتر ئەوە روون تر دەردەکەوت کە ئەوەش رەوتی مێژووی تاریکستانیە و زۆر بەزەقی دنیایی روون کێش (لەئیسلام) دەرکەوت کەسیستەمێکی هەمەلایەنی جیهانی،بۆ هەموو جیهان پێویستە نەك هەر بۆ ئیسلامیەکان لە هەموو لایەکیشەوە لە رووی ئابووری،کۆمەلآیەتی،نیشتمانی،نەژادی،فکری،سیاسی.نەفسی... هەتا بۆ دۆخی کەسیەتیش،بە شێومیە بەکورتیسپی ورەش زۆر بەرووونی لێك دەرکەوتن نەك هەر بۆ زاناو بیر تیژان بەڵکو بو خەڵکی سادەش.ئەو هەنگاوەش پاڵی بەجەماوەر نا بەئاگا بێتەوە لەوخەوە خوشەی کە چەندین سەدەی خاياندوەولەو پرانسیپەی کە (میکافیلی)گوتەنی (میللەت هەر دەم هەڵخەلەتاوە)رزگاری بوو لەو هەل خەلەتاوەی کەم بینیەی.

## • هەل ومەرجی کەسیەتی عەرەب

کەسیەتی عەرەب نەفسیەتی زۆر شکاو بوو بەرامبەر دنیاویستی و نەزانی وتەسلیم بوونی خویان بەتایبەتی تەیاری نەتەوایەتی عەرەب و لەلایەکی ترەوە زاڵی ولێزانی دوژمنانی، بێ ئومێدیەکی

سەرتاسەری رووی لەخەڵکی عەرەب کردبوو وسەرۆکەکانیان لەلا ناشیرن بوو کە تەنیا دوا مەبەستیان کورسیەکەبوو. زۆر جار روانگەی دوژمن پێومرێکی زۆر چاکە بۆ هەڵسەنگاندنی لایەنە جیاجیاکانی لای خۆت لەو روانگەیەشەوە ئەمریکاو ئیسرائیل زۆر دژایەتی ئیسلامیەکانیان دەکرد بە تایبەتی دژایەتی ئەو سێ بزووتنەوەیە(جهاد، حماس، حزب الله) و ئێران وسودانیان دەکرد و(ئێستاش) هەتا لە نێوان (حزب الله ) و (حرکە الامل[1]) کە ئەزموونێکی زۆر ووردو دەوڵەمەندویە مانایەبزووتنەوەی ئەمەل بزووتنەوەیەکی شیعی لبنانی عەرەبەبەرنامەکەی نیمچە عەلمانیە وئاراستەیەکی نەتەوایەتی هەبوو چونکە ئەو(بێداریە وراپوونە)ئیسلامی بوو نەك (مەزهەبی)وەك هەندێك تەیاری جیهانی وای لەقالب دەدەن ئەوا حزب الله لەمەناوی ئەو حرکەیەشین بوو وبە ئاراستەیەکی ئیسلامی وهەرچەند حرکەی ئەمەل زۆر بەرپەرەکانی کرد وتەیاری نەتەوایەتی عەرەب کە (وولأتانی‌عربیش) پاڵپشتیان کرد بەڵام هەر لەئاست هەڵچوونی حزب الله کزبووە کە گەیشتە ئەو ئەنجامەی ئێستا..بەو شێوەیە دیوارەکانی نەتەوایەتی ومەزهەبی و ئەژادی و چینایەتی...بەرگەی تەوژمی ئیسلامیاننەگرت کەوا بەگورهاتە مەیدان بەوسیاسەتەی کە مەبدەئی پیرۆز لە سەرووی بەرژەوەندی بێت کە ئەو مەبدەئە دوای باوی هەبوو لەپێشدا وئێستاش هەموو حزبەکانی عەرەبی بە سەرۆك ولێپسراوەکانیانەوە ولە سەرئەو جۆرە رێبازو سیاسەتە دەرۆیشتن(سیاسەتی مکاڤیلی)پێ دەڵێن، کە سیاسەت وئەخلاق لێك جیا دەکاتەوە و مەبەستە بنچینەییەکە حوکمەکە بەرژەوەندی شەخصیە جا بە هەر ئامرازێك بێت، جا عرب فرۆشتنە، خاك فرۆشتنەشایین فرۆشتنە...ئێستاش وا دەبینین هەموو وولأتانی عەرەب سەر بەدیوەخانی ئەمریکان کە چی ئەو لەساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧سێ ڤیتۆیی لە(امم المتحدە)بە کار هێنا هەر سێك دژی عەرەب بووەوە یەکەم وولأتیش بوو١٥٠ملیون دولاری بۆ کردنەوەی سەفارەت لە قودس تەرخان کرد، بەوشێوەیە عەلمانیەتی عەرەبی خاوەنی مەبدەئی نەگۆر نەما،ئێران گەورەترین ومەترسیترین پشتیوان بوو لەسەر ئیسرائیل کەچی تەیاری عەرەبی جەنگێکی گەورەیان لەگەڵ کرد(٨)ساڵی خایەندوزۆر جار ئیسرائیل لە کاتی شکانی عێراق هەرەشەی خۆ تێوەردانی دەکرد لەدژی ئێران بیجگە لە لیبیا وسودان وسوریا گوایە پارێزگاری لە دیوی رۆژهەلأتی عەرەب دەکەن ئەگەر ئەو شەڕەعەرەب نەیان کردبایە دەبوایە ئیسرائیل بیکا...جا سەرنج بدە ستراتیجیەتی عەرەب تا چ رادەیەك مالویران بووەسەری لەکوێ کلکی لە کوێ. بەوشێوەیە بە هەست نەك تەنها بە عەقڵ بۆی دەرکەوت ئیسلام تاکە رزگارکاریەتی ئەوەی تر تەنها هەڵخەڵەتاندنە،ئەو راستیە زیاتر لە وولأتانی رۆشەنبیر و ئازاد دا دەدرەوشایەوە، دیارە جەزائیریش هەردوو مەرجی لێ‌سازبوو کە زەمینەیەکی زۆر لەبار بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی رەخساو کەوا بە خێرایی گەشە بکات..

---

[1] حرکةالامل: سەرۆکەکەی لەپێشدا (موسی صدر)بوو کە لەسەفەری نێوان لیبیا بۆ ئیتالیا بزر بووله ساڵی ٩٧٧ ئێستاش (نبیه بری)سەرۆکیەتی.

# دروست بوونی بەرەی (ئینقاذ) ی ئیسلامی لە جەزائیر

## کورتە مێژوویەک:

هەر لەسەرەتای شۆرشی جەزائیر شێخ ئیبراهیم لە گەڵ عبد الحمید بن بادیس (جمعیة العلماء المسلمین) یان بە رێوە دەبرد،تێکەڵ بەشۆرشی جەزائیر بوون لەژێر دوروشمێکی یەکگرتووکە بەیانی نۆڤمبری١٩٥٤ بەناوبانگە.دروشمەکەی:(دروست کردنی دەوڵەتی جەزائیری سەربەخۆ و دیموکراسیو سوشیالستیدا لەچوار چێوەی پرانسیپەکانی ئیسلام) لەگەڵ (جبهة التحریر الوطني)خەباتیان دەکرد لەدژی داگیرکارانی فرنسا.لەدوای سەرکەوتن وئەو هەمووچاکەیەی شێخ بشیر کە بەژداریەکی بنچینەی لە شۆرش کرد هەتا سەفەری کوردستانیشی کردووە بۆ یارمەتی کۆکردنەوەو هاریکاری کەچی لەدوای ئەوەی (احمد بن بلا)بووە سەرۆك کۆماری دەوڵەتی جەزائیری دروست بوو ئەو جمعیەی هەڵوەشاندەوە لە ١٩٦٢وە شێخ بشیری دوورخستەوە تا وەفاتی کرد لەدوای ئەوان ئەو کاروانە لەلایەن(احمد سحنون)و(عمر العرباوی) و (عبدالطیف سلطان)وە مفکری گەورە(مالك بن نبی) بەرێوە دەچوو وبەردەوام بەرەنگاری چەپەکان دەبوونەوە کە زۆر باویان هەبوولەو سەردەمی، هەروەها کتابەکانی شهید سیدقطب -خوا لیّی خۆشبیّ-و حسن ترابی وشەهیدمحمد باقر صدر...زۆر بەکار بووە لەسەرووی ئەفریقیاهەریەکە لەقۆناغی خۆی. دوای ئەوی هەواری بومیدین دەسەلأتی لە (احمدبن بلا)ستاند زیاتر جەزائیری بەرەو سۆشیالستیەت ومارکسیەت برد،بۆیەش زۆر گوشاری خستە سەر رەوتە ئیسلامیەکان و جم وجۆڵی ئیسلامیش هەر لەبواری دیراساتی ئەدەب ورەوشنبیری وکۆمەڵەی خەیری دوور لەسیاسەت و، بە بەشداری مامۆستا ودکتۆرانی زانکۆ بەرێوە دەچوو، (شێخ هاشم یتجانی)وەك پێشەنگ دەرکەوت و(جمعیەی القیم) یان دروست کرد وەك درێژکراوە بۆ(جمعیەی العلماء...) دوای دیسان هەڵوەشێنرایەوە لەلایەن هەواری بومیدین بە هۆی دەنگ هەڵ برین لە دژی تاوانی گەورەی لە سێدارەدانی (شەهید سید قطب-خوا لیّی خۆش بیّ-) ئینجا لە دەورانی ساڵی ١٩٦٦ کۆمەڵەی (التبلیغ والدعوە) سەری هەڵداو لە گەڵ مامۆستا مالك بن نبی خەریکی کۆر و کۆبوونەوەی نا سیاسی بوون چەندین کەسیەتی وەك عبد العزیز بولیقە، محمد جاب الله، عبد الوهاب حمودە، عبد الناصر حمیش پەیدابوون، یەکەم مزگەوتی ناوەندیان بنیات نا لە جەزائیر،لە سەروبەرەدا لە زانکۆکان ئیسلامەتی شان بە شانی (شیوعیەتی توند)چەکەرەی کرد، یکەم کۆبوونەوەی ناسینی فکری ئیسلامی لە کانونی یەکەم ساڵی ١٩٦٨رێکخراو لەسەر هەمان شێوە (طراز) بەسترا.

مزگەوتی زانکۆ لە وەهران و حراش بن عکنون لەساڵی ١٩٧٠ دامەزێنرا، بۆ یەکەم جاریش لە زانکۆکان کە سفوری هەرەتی بوو (پۆشەك)ی لیّ پەیدا بوو، بەو جۆرە رەگەزی ئافەرەتیش هاتنە گۆرەپانی بانگی ئیسلامی هێواش و دوور لە سیاسەت، تا ساڵی ١٩٧١ ئەو چالاکیانە ناوچەکانی تری جەزائیریشی گرتەوە، لەساڵی ١٩٧٣دا کێشە بۆ ئەو کۆمەڵەیە دروست بوو کاتیّ مزگەوتی ناوەندیان سووتاند و دەست درێژیش کرایە سەر م/ مالك بنی نبی و دوای هەر ئەو ساڵی ٣١-١٠-١٩٧٣ وەفاتی کرد، دوای ساڵی ١٩٧٤ کۆمەڵی (جماعة التبلیغ والدعوة) بە تۆمەتی پیلان دژی دەولەت

زۆربەیان دەستگیر کران، هەروەها برایانی (ئیخوان) بەسەرۆکایەتی (محفوظ نحناح) کاری هێواشی دوور لە سیاسەت و هەڕەشە لەسەر فەرمان ڕەوایەکان ئەنجام دەدا.

لە ساڵی ١٩٧٥ جم و جۆڵێك دژی (یاسای خێزانی) لەلایەن ئیسلامیەکان سەری هەڵدا، خەڵکی تۆزێك بە ئاگا هێناوە کە ئیسلام ئاینی دەوڵەتیشە نەك شەخسی، لە ساڵەکانی ١٩٧٨ بەتایبەتی دوای مردنی (بۆمیدیان) و هاتنی (شاذلی بن جدید) لە یەکەمی دیسمبر ساڵی ١٩٧٨ دوای پەرپەوە ناو خویندکارانی ناوەندی و ئامادەیش، لێرەدا کرتن و ڕاونان دەستی پێکرد، د.عباس مدنی و محفوظ نحناح گیران، بەرە و ساڵانی ٧٩-١٩٨٢ بۆ هاری بێداری ئیسلامیە لەسەرووی ئەفریقیان واتە: ئەوەش زۆر بەگەرمی دووپاتی بۆچوونەکەی ئێمەی‌یە کە دەڵێن شورشی ئێران یەك لە کارکەرە ڕاستەوخۆ ڕابوونی ئیسلامی‌یە هەر لە گۆڤاری (منقذ) ژمارە (١) ساڵی ١٩٩٣ی بەرەی (ئینقاذ) هاتووە (لە سەرەتای هەشتاکان بێداری ئیسلامی لە جەزائیر تەقیەوە و گۆڕەپانی سیاسی داگیر کرد و گەیشتە ئەو پایە، لە سالی ١٩٨٢ لە زانکۆکان داوا لە حکومەت بکەن تۆبەی سیاسی بکات، هەر لەو کاتە شیوعیەت بەرەو کز بوون بوو لە بەرانبەر بەرەنگاری زانایان (عبد اللطیف سلطاني، العرباوي، الیاجوري، سحنون،...) تەوژمێکی زیتریش لە لایەن شۆڕشی ئیسلامی ئیرانی پێ درا.هەموو ئەوانەی بوونە هۆی ئەو تەقینەوە بە هێزە).

دیارە سروشتی جەزائیر و شاخ و داخ و داستان و هەموو ئەوانەی سەرووش زەمینەیەکی ساز دا بۆ دروست بوونی مەفرەزەی سەرەتایی چەکداری، هەر لەو ساڵانیش بناغەکانی دروست بوو، بە سەرۆکایەتی (مصطفی بو یعلی) لەگەڵ کەسانی وەك (بن عمار محمود، جعفر برکاني،عبدالقادر شبوطي،..) کە ئەوەیان لە دوایی‌دا ناوبانگێکی زۆری دەرکرد و بە (اللواء) ناو دەبرا، لە ساڵی ١٩٨٧ ئاسایشی جەزائیر توانی بویعلی شەهید بکات، بەڵام بێداری ئیسلامی یەکجار زۆر پەرەی سەند هەتا ساڵی ١٩٨٩ خۆپیشاندان و مان گرتنەکانی قوتابیان و بێداری دیموکراسی لە جیهانیش زەنگی لێدا، ناچار (شاذلی بن جدید) لە ساڵی ١٩٨٩ لەسەر تەلەفزیۆن پێشنیاری چاکردنی دەستووری وولاتی کرد.نۆرەی بەرەی ئینقاذی ئیسلامی هات.

## دروست بوونی (بەرەی ئینقاذ):

لە پاش خۆپیشاندانەکانی قوتابیان و خەڵکی جەزائیر بە گشتی کەش و هەوایەکی سیاسی ئازاد و لەبار هاتە پێش،(شاذلی بن جدید) وەك (گۆرباتچۆڤ)ئاسا دەستی بە چاکسازی وولات کرد، لە ١٩/دیسمبر/١٩٨٨ بە ئاشکرا لە تەلەفزیۆن لە پاش سەعات (٨)ی ئێوارە شاذلی بن جدید بە دەم و چاوێکی ماندووەوە دەستی بە قسە کرد بۆ خەڵکی جەزائیر و تیایدا هەموو ئەو کێشانەی خستە پاڵ (جبهة التحریر) وە لە شەوی ١٠/ئۆکتۆبەر/١٩٨٨ دانی نا بە هەموو ئەو هەڵانە ئیتر بەڵێنی چاکسازی و دیمکراتزەکردنی وولاتی دا. لە شباطی ١٩٨٩ بە ڕاپرسێك کە ٩٢٪ بەڵێ بوو بۆ گۆڕینی دەستوور و کۆتایی بە فەرمان ڕەوایی تاکە حزبی هێنا، ئازادی و دیموکراسی و فرە لایانی جار دا، هەموو ئەوانە لە ڕۆژی ١٩٨٩/٢/٢٣ بلاو کرایەوە لە لایەن شاذلی بن جدید، ئیدی ئاسۆیەکی ڕاستەقینە و

فراوان دروست بوو، له دوای مانگێك له مارس ١٩٨٩ بەرەی ئینقاذ لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەیی لەسەر تەلەفزیۆن بڵاو کرایەوە بە ئامادە بوونی علی بن حاج، هاشمی سحنون، بن غرور زبده، بشیر فقیە (خوا لێی ڕازی بێ)، احمد مرانی، عبد القادر صحراوی (خوا لێی ڕازی بێ) بە سەرۆکایەتی عباس مدنی و جێگریشی علی بن حاج و شورایەکیان پێك هێنا لە سەرجەم هێل و باڵە ئیسلامیەکان کەتیایدا سەرەڕای ئەوانەی سەروو (عبدالقادر حاشانی، رابح الکبیر، قمر الدین خربانی،عبدالله انسي، سعيد مخلوفي، عبدالقادر شبوطی، شیخ محمد سعید، شیخ عبدالقادر رجام،...) شورا بوون زۆر بە خێرایی پەرەی سەند وتەنیەوە گۆڕەپانەکانی سیاسی و فیکری و ڕۆشنبیری... کە ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە (٣) ملیۆن کە بە زەبەلاح ترین کۆمەڵە دەژمێرێت لەسەر ڕووی زەمین کە فەرمان ڕەوا نەبێت.

بەرەی ئینقاذ توانیبووی باوەشی فراوان بکات جێگەی هەموو باڵە ئیسلامیەکانی تیا ببێتەوە، بەرنامە وپلانێکی سیاسی زۆر وورد و زانستیانەشیان دارشت، نەرم و نیان بوو لەوەی نەرم تر دەتوایەوە و لە ئیسلام دەردەچوو، زۆربەیان تەبا بوون لەگەڵ ئازادی و دیموکراسی و هەڵبژاردن جگە لە علی بن حاج کە لە نووسراوەکانی دەردەکەوێ کە بۆچونێکی رادیکالی قوراخ لە دیموکراتی هەبوو، نارەزایی‌یەکانیشیان لە حکومەت بەشێوەی زۆر دیموکراسیانەوە دەربڕینی هاوچەرخ بوو.

**بەشی سێیەم**

## بە کورتی هۆیەکانی سەرکەوتنی ئیسلامی لەسەرووە ئەفریقیا (چەند وانە بۆ کوردستانیش)

ئەوەی بۆ ئێمەی کورد گرنگە دوو هۆی زۆر پێویستن لێرە تۆمار بکرێ وەك وانە و پەند لێوەرگرتن بۆ پەرە پێدانی (دعوە) و پارێزگاری لێ کردنی کە لە جەزائیر بووە هۆی خێرایی گەشە کردن:

١) سەرکردایەتی زۆر لێزان و بەکار توانیان ئەو هەموو تەیار و کەسایەتی‌یە بیر جیا جیایانە کۆ بکەنەوە، هەنگاوەکانیان دانایانە و چالاك و مودەبیر بوون، زۆربەیان ڕەوشنبیر و مامۆستای زانکۆ بوون، ئیشەکانیان بە جوانی دابەش کردبوو، مامۆستای مزگەوت کە ئەزموونی سیاسی نی‌یە هەر ئیشی خۆی دەکرد لە بواری دەعوە و ووتار دیارە سۆز و هەڵچونی ووتارێکی مزگەوت زۆر جیایە لەگەڵ بەرنامە و ستراجیەتی نێو دەوڵەتی، دەبێ چاك ئەوە بزانین کە دوژمنان بە ستراجیانە دەیانەوێ لەگەڵ سەرکردایەتی‌یەکی ئیسلامی نەشارەزا تەعامل بکات، لە کوردستان ئەوەیان سوودی بۆ ناحەزانی ئیسلام وەرگیراوە بەڵام لە جەزائیر ئەو مەجالە لەسەرەتادا وەرنەگیرا و مامۆستایانی سیاسی ئەرکی هەڵسوڕانی ئیش و کاری سیاسی وولات و ئیقلیم و دووەلی پێ سپێردرا بە چاکیش

دەیان زانی لە گەڵ دەرکەوتە نوێ یەکانی وەك مەسەلەی دیموکراتی وپەرلەمان وفرەلایەنی سەربەستی وئازادی وچاپەمەنی و پێکەوەژیانی سیاسی ودەزگاسیاسییەکان وەك دەوڵەت وحزبی وهەڵس وکەوت بکەن، هیچ دەرفەتێك بە خەسارەت چوو،دەرگای گفتوگۆی هێواشیان لە گەڵ رەوشەنبیرو حزب ولایەنە چەپ وعەلمانیەکان ونووسەروئەکادیمیەکانکردەوە (کلم الناس علی قدر عقولهم) یان بە جوانی بیادەکردو توانیان هەموو کۆڕو ئەنجومەن وکۆمەڵ وتوێژەکانی کۆمەڵایەتی جەزائیر کۆنترۆڵی فکری بکەن ئینجا کۆنترۆڵی واقیعیشیان کرد، بە هۆی منازەرە وموداخلەوە توانیان بە ساناى بێ بڕواوبە بڕوا بۆ خەڵکی سادە بێك بدەنەوە ...ئەو هەنگاوە لە جەزائیر و سودان ومصر وسەرووی ئەفریقیا زۆر سەرکەوتنی بە دەست هێنا، ئەو قۆناغەی نەرمی بە دەسکەوتێکی زۆرەوە بەرێ کرا، دوای (ئینقلاب) و توندو تیژی وەك حکمەتی (سیرە) ئەو نەرمیەش بووە توندی وئەو سەرکردانە لە زیندان بوون،لە مەترسی دابوون، داوایان لێکرا کە فتوا بدەن مجاهدەکان بێنەوەو خۆیان بە دەستەوە بدەن،دیارە ئەوانیش نەترسان، فتواشیان دا کە ئەوە شۆرشێکی چەکدارە دژی ئەوئینقلابە دروست بووە ئەو جیهادەش دژی کوفرە بە ناوی ئەوانیش بلاوکرایەوە(جا هەریەکە سەرنج بداتە سەرۆك ورابەری خۆی ئاخۆ وەك ئەوانن).

٢-یەك بەرنامەی کاری چەسپاو هەبوو چ لە مزگەوت ولادێیەکان و چ لەشارە گەورەکان....ئەوەبوو بەهەرچۆنێك بێت ئەو (دەعومیە)ئیش بکات وبپارێزرێ وبشرزانرێ لە گەڵ چ بە شێك لە میللەت، ئەوەش بە هۆی دانانی سەرپەرشتیار لە هەرشوێنێك دروست کردنی پەیوەندیەکی چاك وئاسایی لە گەڵ دەسەلاتدارانی ناوچەکە لە بەرپرسانی حکومی وکۆمەلایەتی و ئایینی،رووبەرووی خەڵکێکی نا شایستەو بێئاست نەبنەوەو دەعوەکە ماندوو نەکرێ پێیان وببێتە هۆی دروست بوونی کۆسپ و بەرگری لە رەوتی دەعوەکەبەڵکو ریزی کێخواو شێخ و مەلاو ریش سپی و لێپسراوانیان دەگرت وبێ ئەوەی ناویان بێنن یان لەگەڵ عادەتوو خورەوشتی خەڵکەکە بووەستن یان لەگەڵ ئەو زیادو کەمیەی کە لە ئیسلامیاندا هێنابوو..هەموو ئەوانە هەڵگیرابوون بۆگۆرانکاریەکی بنچینەی کە گۆرینی حوکم دێنێتە دی.

ئەوەی لایان گرنگ بوو ژێر خانێکی (بناء تحتی) سیاسیان دارشت بۆ دروست کردنی نەوەیەکی نوێ بە ئیلتزام لە گەنج ورەوشەنبیران دروست بکەن بە رێبازی قورئان و سوننەت، بۆیە زۆر بە خێرای بێ کۆسپ دەعوەکەیان سەرتاسەری جەزائیری داگرت وئەو بەرهەمە گەورەی هێنایە دی. زۆر لایەنی تر هەیە وەك برەو دان بە رێکخستن وراگەیاندن ودەوراتی سیاسی وفکریو...زۆر مەسەلەی تر بەلام ئەم دووخاڵە سەرچاوەی هەمووانن.

## •بەشداری لە هەڵبژاردن :

بەرەی (لینقاذ) لە کۆمەڵێك تەوژم پێك هاتبوو،بۆچوونی جیاجیای تێدابوو،هەر هەمووی لە گەڵ هەڵبژاردن نەبوو(دیارە بە بەڵگەوە) بەلام کەمایەتی بوون ، ئێستا (جماعة الاسلامیة المسلحة) ئەو

درێژکراوەیە، وا بەکورتی بەڵگەی هەردوو لا کورت دەکەینەوە، کە لە کوردستانی خۆشمان کەم وکورتێك لەو دەمەتەقێیە هەیە ئاخۆ بەشداری لە هەڵبژدن و دیموکراتی پشتوانی شەرعی هەیە؟؟

رای بەشدار نەکردن: بە کورتی لەو چەند خاڵیە کە لە نووسینەکانی کۆمەڵێك نووسەری وەك (علی بلحاج) و (عمرعبد الحکیم) راگەیاندنەکانی(**الجماعة الاسلامیة**) وەرگیراوە:

١-دیموکراتی واتە(فەرمان رەوەی گەل) واتە سەرچاوەی حوکم بۆ میللەتە، ئەڕێش پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانە کە حوکم تەنها بۆ خوای پەروەردیگارە.

٢-لە دیموکراتیەت تا ئەو رادە ئازادی هەیە لە ئایین هەڵگەڕێتەوە و هەر ئاینێك و بیروباوەرێکی سیاسی وەرگری، کە ئەوەش پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە.

٣-لە پەرلەمانا کە شوێنی یاسا دانانە دەنگی زۆرایەتی دەخوات ئەگەر ئەو یاسایە دژی دەق وئایەتەکانی قورئانیش بێت. زۆر بەڵگەی تر وەك لق لێبوونەوەی هەیە بەڵام ئەوە گوشراوەکەیەتی،ئەو موسولمانانە پێیان وایە ئەو بەشداری کردنەی هەڵبژاردن ودیموکراتیەت و....یاریەکی رۆژئاوایەو بۆ هەڵخەڵەتاندنی موسولمانانە و بیدعەیە ن دەڵێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کەئیسلام بە بێ جهاد ناگات بە حوکم.

بەڵگەکانی لای بەشداری کردنیش زۆرە بەکورتی ئەوەیە:-

١-خۆشەویست (ﷺ) زۆر هەنگاوی ناوە لە سەرەتاکانی (دعوە) پێچەوانەی دەقیش بووە،وەك (رێکەوت نامەی حودەیبیە)، بەڵام حیکمەتی تیابووەو خزمەتی دەعوەی کردووە، کردوویەتی.

٢-لە دیموکراتیەتدا وەك ئامرازێکە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام کە تەنیا لە ئاشتیدا ئەو بوارە هەیە.

٣-هەوڵ دەدرێت زۆربەی خەڵك تێبگەیەنرێت کە خەڵکی قورئان هەڵبژێرن نەك ئەو رێبازە دەستکردەکانی تر ، لە مێژووشدا نمونەی فتحی ئاشتیانە هەیە ئیسلامبوونی ئاشتیانەی خەڵکی ئاسیاو خواروی ئاسیاو وەك مالیزیاو ئەندەنوسیاو هەندی شوێنی ئەوروپەو ئەفریقەو شوێنی تر...

٤-لە پەرلەمانا ئەگەر کەمایەتیش بووی مادام بەرگریت لە ئیسلام کرد دژی هەریاسایەك بوویت کە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام ناگونجێ ئەوا تکلیفی شەرعیت لەسەر نامێنێ ، ئنجا ئەو پرۆسەیەبە چاو دێنێ‌خەڵکی سادە رێگەی دوور زۆر کورت دەکاتەوە، و ناحەق بە ئاسانی لێك جیا دەبێتەوە.

٥-لەو ماوەی‌کەبەشداری لە ژیانی سیاسی هێمن ئەوا...وەك دەرفەتێکی چاك دەقۆزێتەوە خۆ ئامادە دەکەی بۆ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە چۆن سەرکەوتووبووە.

## هەڵسەنگاندنێکی خێرا:

دیارە زۆر کێشەی تر ئاوا پێچەوانە هەیە وهەردوولا ئایەت و فەرموودەشیان هەیە بۆ پاڵپشت کردنی بۆچوونەکەی خۆیان، راستیەکەش ئەوەیە ئەو جۆرە پێچەوانانە هەڵ ومەرج وقۆناغی جیا بووە، زەمان و زەمینی جیا بووە، بەڵام ئێستا بۆیان لێك ناکرێتەوەو وەك کێشە دەمێنێتەوە ئەگینا لە بنچینەدا هیچ کێشەیەك نیە لە ناو قورئان وسونەتدا ﴿..ولو کان من عند غیر اللە لوجدوا فیە اختلافا

**كڵێرا**. هیچ دەقی پێچەوانەی یەکتر نیە... جا بۆ ئەو مەسەلەیە ش هەروایە هەتا ئێستا پێنج نمونەی **دەوڵەتی** ئیسلامیمان لە بەر دەست دایە کە ئیسلام (بە نسبەتێکی دیاری کراو فەرمان ڕەوایە) وەك (**ئێران**، **سودان**، ئەفغانستان، چیچان، بۆسنە..) هیچیان بە ڕێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتیانە نەهاتوونە سەر حوکم . واتە هێشتا نمونەیەکی واقعی نیە بۆ ڕێگای ئاشتی، نمونەیەکی لاوازی پاکستانی هەیە کە (رابگهای ئیسلامیە)بە سەرۆکایەتی (نواز شریف) کە ئێستا لە سەر حوکمن بەڵام **ئەوان** (ولاء براء)ی دووملیان بە تەرازووی شەرع نیە وەکو ئێران وسودان ووڵاتانی تر ،لە نامۆژگاریەکی بەرەی (**نینقاذیش**)بۆ حزبی رفاه کە لە (منقذ) ژ:٤ی سالی ١٩٩٤ هاتووە:(ئەو لادەرو بێبەڵێنانە باوەڕیان بە دیموکراتی ومافی مرۆڤ نیە بەو ناوە دەگرن ودەکوژن و وەسیەتمان ئەوەیە پەند لەبەرەی "**ئینقاذ**" وەرگرن ئەم ئایەتە هەردەم سەردێر بێت ﴿**وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم**..﴾) سەرارای ئەوەش ئازادی ودیموکراتی زۆر سوودی لێوەردەگیری، ئەوەی لێی بە هەڵە داچووینە زۆر لە موسلمانانی دڵسۆز ئەوەیە کە دیموکراتی ئەو مانایە ڕەسەنەی خۆی نەماوە وەك پێناسەی خۆی، بەڵکو پتر لە مەبەستی سەربەستی فکرو دروست بوونی فرەلایەنی حزبی یە هەروەها لایەنی چاك وخراپیش لە دیموکراتی هەیە، ئەوەش لە (بابیمنفعە ومفسدە)لێکی بدەیتەوە کە بەشێکە لە (**فقه الموازنة**) تکایە سەرنج بدە نموونەکەی ابن تیمییە لە دۆخی سێیەم لە (**فصل تعارض الحسنات والسيئات**) بەڕاستی ئاسمان وڕیسمانی فەرقە لە گەڵ دیکتاتۆریەت کە بەدیلەکەیەتی لە چوار چێوەی عەلمانیەت، بۆیە ناکرێت هەڵس وکەوت لە گەڵ دیموکراتی بە ئاسایی بکەیت، دەبێت ئیسلامیەکان زۆر ووشیاربن لەو مەسەلانە ١٠٠حسابی پان وبەرینی و قولایی و ئەگەرەکانی ئەنجامی بکەینەوە، ڕەت کردنەوەشی پازدانە لە دەرفەتی زێرین. (پەیمانی حودەیبیە)کۆگایەکی گەورەی زانیاری لێهەڵێنجانە بۆ کاروانی سیاسی زۆر پەندو ڕێسایی فقهی سیاسیمان دەکاتە پاڵپشت. ئەگەر چی زۆر لە موسلمانان ئەو پەیمانەیان بە دڵ نەبوو وەك عومەری کوری خەتتاب ﷺ بەڵام حکمەتی زۆری تیابوو لە دوای دەرکەوت قازەنجەکانی بۆ ئیسلام لە زیانەکانی زۆر زیاتربوو، هەر بە ژمارەش پێش پەیمانەکە ١٤٠٠موسلمان هەبوون بەڵام دوای ١٦مانگ ژمارەیان بوو بە ١٠٠٠٠موسلمان، کەواتە ئەو هەنگاوە لە خزمەتی دەعوە بووە هەروەك خۆشەویست لە قۆناغی سەرەتایی بە هەرئامرازێك بووبێت کە جاری وابووە (مبادی)بۆ وەختی تجمید کراوە کە چی لە دوایدابە قازانجی ئیسلام تەواو بووە.بە زۆری لەو هەنگاوانە ویستراوە و ئێستاش هەر ئەمە مەبەستە کە ئیسلامی ڕاستەقینە بە خەڵك ڕاستەوخۆ نیشان بدرێت نەك بە چەواشەی لە لایەن دوژمنانەوە، ئینجا دیموکراتی خودی خۆی ڕیبازێکی کۆمەڵایەتی نیە وەك سوشیال دیموکرات ولیبرال دیموکرات وشوعیەت و سوشیالستی زانستیو...هتد.بەلکو پەیمانێکی کۆمەڵایەتییە، ڕێبازی کۆمەڵایەتی وپەیمانی کۆمەڵایەتی زۆر لێك جیاوازن، ڕێبازی کۆمەڵایەتی تەشریعات وحلال وحەرامی خۆی هەیە، لە یاساکانی و ئامانجی جیایە لە گەڵ حەلال وحەرامی شەریعەتی ئیسلامی، کە هەرگیز ئاشێت و نەشبووە ئیسلامیەکان بەڕێگاو ئامرازی سوشیال دیموکراتیانە یان شیوعیەتەوەبڵێن دەگەینە حوکم یان خزمەتی دەعوەی پێدەکەین چونکە ئامانجن...بەڵام بە دیموکراتیان مەحال نیە، چونکە

دیموکراتی ئامرازە نەك ئامانج، ئامرازە بۆ هەر لایەك کە بتوانی زۆرایەتی مسۆگەر بکات ، دیارە زۆر دۆخی پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاه والسلام) هاتوتە پێش هەر بەنمونە بەشدار بوونی حەزرەتی موسا ﷺ بە ململانێ کردن لە گەڵ سیحر بازەکان لە ئەنجام بە سەر کۆمەڵی بێبڕوا وسحربازەکان سەرکەوتو خزمەتی دعوەکەی پێکردکە چی نەئیسلام ونە ئاینەکانی پێشتریش سحریان بە شتێکی شەرعی نەزانیوە.. دیموکراتی پەرلەمان خودی خۆیان تەنیا گۆتەیەکی مەعنەوین وبێلایەن ئەگینا قەوارەی سەربەخۆیان نیە کێ بەکاریان بهێنێ نی ئەوە..وەك هەموو بەشەکانی تر کە (دووڕوویان هەیە)وەك ئامرازەکانی زانست، ئامرازەکانی ڕاگەیاندن... بۆ نمونە ئامرازی تەلەفزیون: ئەگەر لە دەست بەد ڕەوشتان بوو ئەوا بۆ شتی تێکدەرانە بە کاری دەهێنن. ئا لەو کاتە ئایا ئامرازی تەلەفزیون خودی خۆی خراپەو بدعەیە ودژی ئیسلامە یان بە کارهێنانەکانی؟؟ ئەو مەسەلانە زۆر روونن، مەسەلەی دیموکراتی وپەرلەمانیش هەروایە ئەگەر توانیت ئەو کورسیانەی پەرلەمان بە زۆرایەتیبە دەست بێنیت ئەوا یاساکانی ئیسلامیان دادەڕیژی وەئەگەر کورسیەکانت بە دەست هیناو نەیانهێشت وەك جزائیر ئەوا بابەتێکی ترەیە دەرلە دیموکراتیەت و ودەبێتە دیکتاتۆریەت. ئەو تێبینیانەی بەشێك لە ئیسلامیەکان لە سەر دیموکراتیەت کاتێ ڕاستە ئەگەر دیموکراتی وەك ئامراز ومرنەگیرێو بیکەیە ئامانج، واتە کە بە حوکم گەیشتی دیموکراتی پیادەبکەیت، ئەومیان مەسەلەیەکی ترە جیایە لە گەل ڕەوتی ئیسلامیەکان هەرچەندە هەندێ بزووتنەوەی ئیسلامی لە بابی ئامانج دا (لە پەیرەو پرۆگرامیناوخۆدا) دیموکراتیان کردۆتە ئامانج وەك لە پاکستان لە کۆنەوە لیاقت خان بۆ چوونی (دیمکراتی ئیسلامی) هەبوو، وە (اسحق الفرحان) باس لە شورای ئیسلامی دیمکراتی هاوچەرخ دەکات، لێرەش (یەککرتووی ئیسلامی کوردستان)ی خۆشمان جا ئەومیان بە جێ دێلین با خۆیان وەڵام بدەنەوەنەوەك حکمەتێکی تایبەتی تیابێت.ئەگینا ئیسلام بەرنامەیەکی هەمەلایەنە و تەواوە پێویستی بە پینەی دیموکراتیەت نیە ﴿**اليوم أكملت لكم دينك واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا**﴾ دیموکراتیش بە تەرازووی شەرعەوە لە خانەی نا شەرعی دادەنرێت، زۆر ئافاتی کۆمەڵایەتیشی پێوەیە لە سەربەستیە بێسنوورەی، ئەگەرچی ناشبێت ئەو بەدڕەوشتیە و بەرەڵاییەی جنسی..بە تەنها بدرێتەپاڵ دیموکراتیەت، چونکە ئەوەتا لە ڕژێمی شای ئێران دیکتاتوری شاهنشاهی بوو کە چی بەدڕەوشتی وفەسادی کۆمەڵی بێوێنە بوو.. لەلایەکی تریش لە ١٠٠حسابی ئیسلامیەکان بۆ دیموکراتی وپەرلەمان دەبێ ئەوەبزانین کە ناحەزانی ئیسلام کە خۆیان ئەوەندە دیموکراتی پەروەرنینە و لێیلەهەنجەتن بەتایبەتی کە دەبینن لە هەناوی دیموکراتیش ئیسلامی لێ پەیدا دەبێت، بۆیە حکومەتەکانی جەزائیر و تونس ومیصر و....دانشتن لە گەڵ ئیسلامیەکان ڕەت دەکەنەوە، لە ئاخاوتنێکی حسنی مبارك لە ١٩٩٧/١١/٢٢دەڵێ (لە دانیشتن زۆرمان زەرەر کردوو چیتر دانیشتن نیە).. ئەوە رای گشتی عەلمانیە بۆ سەرمایەداری جیهانیشە.زۆر حەزدەکەن کە ئیسلامیەکان دژی دیموکراتی ودانیشتن بووەستن،زۆر خزمەتی بەرنامەو پلانەکانی ئەوان دەکات قسەکەی حوسنی مبارك ڕاستە ئیسلامیەکان زۆر سوودیان لە ئازادی دیموکراتی وەرگرتووە باشترین بەڵگە لە هەر شوێنێك دیموکراتی لێبێت بزووتنەوەی ئیسلامی بە خێرای گەشەی کردووە بەراوورد بکە لە نێوان

جزائیر و وولاتانی دەوروبەری وەك مغریب ولیبیاو تونس.یان لە نێوان تورکیا وسوریا، هۆیەکەش زۆر سادە ساکارە کە ئیسلام لە هەموو رێبازەکانی تر لە رووی فکریەوە دەوڵەمەندترە، جا کە دیموکراتی هەبوو بەو دەوڵەمەندیە بەخێرایی دیار دەکەوێت ودێتە واقع و بە پێچەوانەش کە دیموکراتی نەبوو دیکتاتۆری بوو ئەوا ئەو واقیعە دروست نابێت. هەتا جیهادیش دژی دیکتاتۆریەت پێویستی بە رەگ وریشەداکوتان و خۆناساندن دەبێت بە خەڵك بە لایەنی کەمەوە لە سەرەتادا پێویستی بە سەربەستی بلاوکردنەوەی ئیسلام و هەشیارکردنەوەی موسلمانان دەبێت، جا نابێت ئیسلامیەکان هیچ دوودلیەکیان هەبێت لە باشتریەتی دیموکراتیەت لە دیکتاتۆریەت، لە ئیسلامدا وەك هەموو لایەك دەزانین‌کاتێك شتێك حەرام دەکرێت کە بەدیلەکەی ئامادەبێت، وەك حەزرەتی‌عومەر ﷺ دەست برینی لە سەر دزی راگرت چونکە بەدیلەکەی تەواو نەبوو ، جا کەواتە ئیسلام وەك بەرنامە فەرمان رەوانەبوو ، کە دیموکراتی حەرام دەکەی واتە دیکتاتۆریەتت ویست بۆیە لە دیکتاتۆریەت دا ئەگەر داوای دیموکراتیەت کرد وەك قۆناغێك هەڵەت نەکردووە..

بەوشێوەیە بەرەی ئینقاذ چووە گۆرەپانی هەڵبژاردن بە خۆی وهەموو تەیارە ئیسلامیەکان هەتا ئەوانەی دەرەوەش وەك (حزبی نهضة الاسلامیة)بە سەرۆکایەتی عبد الله جاب الله داوای لە هەموو لایەنگرانی خۆی کردکە دەنگ بدەنە بەرەی ئینقاذ، تەنیا (حماس)نەبێت بە سەرۆکایەتی (محفوظ نحناح) بێ دەنگ بوو کە ئەویش دەنگێکی زۆر لاوازی هێنا نەگەیشتە لە ٢٪.

## بەشی چوارەم

# هەڵبژاردنی جەزائیر و ئەنجامەکانی

٢٣/فبرایر/١٩٨٩بووە وەچەرخانێکی مێژووی رەوتی جەزائیر، دەستووری وولات چاك کرا بە ئیستفتاء کە لە٩٢٪دەنگی پێدرا، کۆتایی بە حوکمی تاکە حزبی(جبهة التحریر) هێنا کە لەساڵی ١٩٦٢وە فەرمان رەوا بوو، لە سەرەتادا پرۆسەی دیمکراتی بە هەڵبژاردنی شارەوانی دەستی پێ کرد لە جون/١٩٨٩لە سەرجەمی ١٣٠٠ شارەوانی لە ٨٥٠ شارەوانی بەرەی (ئینقاذ) لێی سەرکەوتووبوو، واتە ٧٠٪ی دەنگەکانی بە دەست هێنا. زۆر گۆرانکاری بنەرەتی لە هێمنی و دادپەروەری و بوژاندنەوەی هەژاران و نەمانی بەرتیل وبە کاربوونی بێکاری..بەرپاکرد.بۆ کاربەدەستەبەرزەکانی جەزائیر دەرکەوت کە ئەو سەلتەنەتەی دنیایان وا خەریکە بە شۆرشێکی میللی ئاشتیان وەردەگەرێو سەرۆمەری(جبهة التحریر) هیچ رەسیندیکی نەماوە هەروەك (بەرەی‌ساندینستا)ی نیکاراگواو سەرۆکەکەی (دانیال ئورتیگا)کە (سۆمۆزا) یان روخاند کە چی لە هەڵبژاردن دەرنەچوو، بۆیە دەستیان بە پرۆسەی (بەگ دیموکراتی) کردوو، (پرۆفیسۆرعەبباس مەدەنی) زیندانی کراو (علی بلحاج)و زۆری تر لە

گەورە رۆشنبیران ووەك بەرگریەك لە هەلبژاردن وپەرلەمان كە لە ٢٦ دیسەمبەر/١٩٩١ ئەنجام دەدریێت.بەپێی نەخشەو زانیاریەكان بەرپرسانی حكومەتی جەزائیر وایانزانی لە پاش ئەو ئیجرائاتانە بەرەی (**ئینقاذ**) تەنها لە ٣٠٪ی دەنگی پێدەیێت بویە (**شاذلی بن جدید**) چەند جارێك مەیدانی لێخواستن كە با بەژداری ئە هەلبژاردنە بكەن نەگەر لە خویان رادەبینن. چونكە هەندێ **نارازی** هەبوون كە بەشداری نەكرێ مادام سەركردەكان لە زیندان بن.بەلأم كە هەلبژاردن كرا گەورەترین راپەرینی دەنگ كە لە مێژووی هەلبژاردن وینەی نەبوو بە هەلبژاردنی سحری ناوبانگی **دەر**كرد بە شێوەیەی خوارەوە:-

١-بەرەی (ئینقاذ): دەنگەكانی هەلبژاردنی شارەوانی زیاتری كرد لە ٧٠٪ بوو بە ٨٦٪ی دەنگ .
٥،٣ملیون دەنگی لە دەورەی یەكەم هینا كە دەكاتە ١٨٨كورسی. بۆ تێبینی لە هەلبژاردنەكە زۆربەی سەركردایەتی بەرەی (**ئینقاذ**) لە زیندان بوون و لە لایەن (**عبد القادر حشانی**)سەرپەرشتی دەكرا تەنانەت چەقۆیەكیشیان لانەبوو!!

٢-بەرەی رزگاری نیشتمانی (**جبهة التحرير الوطني**) حزبی فەرمان رەوا بوو، سكرتیرەكەی (عبدالحمیدمهری) بو،تەنها ٢٥ كورسی بە دەست هێنا.

٣-بەرەی هێزە سۆسیالستەكان (**جبهة قوى الاشتراكية**) بە سەركردایەتی (حسین ئایەت ئەحمەد)تەنیا (١٥) كورسی بە دەست هێنا.ئەو حزب ولایەنانەی تر دەنگێكی وایان نەهینا كە شایەنی تۆمار كردن بێت. (قایل نەبوون بە ئەنجامەكانی)

## •هەلوەشاندنەوەی هەلبژاردنەكە:

حكوومەتی جەزائیر لەقەبلاندنی واقیعی كۆمەلایەتی جەزائیر زۆر بە هەلەداچووبوو وەك لە پێش تر ووتمان وای زانی تەنیا لە ٣٠٪ دەنگ بۆ بەرەی ئینقاذ دێت، بۆیە هیچ تەقەلایەكی وایان نەكرد بۆ تەزویرو فروفێل وەكو حكومەتانی تری تونس،میسر،عێراق .....بۆیە یەك سەر ئە و ژمارە مێژوویی و تۆقێنەرانەی لێپەیدابوو لە ٨٦٪، ٥،٣ ملیۆن و١٨٨ كورسی .....ئەوەش رێسایەكی سیاسی هەیە دەلێ (رەنووسی شەرم ناكات )واتە هیچ دبلۆماسیەتی نیە .بەرێزەوە یا بەلەف ودەورانەوەمەبەستەكەی بلێ و(تۆ گولێكت هەیە لە باخان ....هتد)یەكسەر ژمارەكەیە ،بۆیە حكومەتی جەزائیر هیچ رێگەو تاكتیكێكی نەما جگە لەوەی راستەوخۆ و بەراشكاوی لەپرۆسەی دیموكراتی پەشیمان ببێتەوە ، ئەنجامەكانی هەلبژاردن هەلوەشێنێتەوە.

## • كاردانەوەی دوەلی بۆ هەلبژاردن :

ئەفریقیا لەهەموو شوێنەكانی تر دەستی ئەمریكاو ئەوروپای تیایە ، لەهەموو كێشەكان راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ هەم لێی (گرفن)هەم هەلگیرسێنەریشن، لە كۆنەوە تا ئێستا لە ئەنگولا، رۆدیسیا (خوارووی ئەفریقیای ئێستا)، هەرێمی شابای (زائیر)، كێشەی نێوان صومال و "ئەثیوبیا"لە سەر (ئۆگادین)، چاد.....ئێستاش لە سودان ، جەزائیر....هتد. بە تایبەتی فەرەنسا،هەر بۆیەش پێش

هەموو وولاّتانی ڕۆژئاوا فەرمنسانیكەرانی خۆی دەربڕیو دەستی بە جم وجۆڵی سیاسی ودبلۆماسی كرد ئینجا وولاّتانی تری بە دوا داهاتوو ئەمریكاو بەریتانیاش وایان لە قەڵەم دا چارەنووسی دیموكراتی لە مەترسیی دایە، دەیان ووت جیهان بەرەو كوێ؟؟ بە كورتی دنیا خۆران هەر هەمووی قولاّغ بوون و لە ژێرەوە جەنەراڵەكان دەستیان بە نەخشە دانان كرد، هەرچی وولاّتانی عەرەبیشە لەنێوان بێدەنگی ونیگەرانی دابوون بێجگە لەهێزە شۆرشگێرە راستەقینەكان ،هێزە ئیسلامیەكانی دنیاش جەژنەیان بوو ،ئێران وەك دەولەت زۆر ئومێدوئامانجی لەسەر بنیات كردو دەستخۆشیان لە بەرەی ئینقادد كردو،دەركەوت بۆ هەمووولایەك كە سەردەم سەردەمی ئیسلامە بەهەر رێگایەك بێت چبەجیهاد چ بەهێمنیو چپ.ەجوولانەوەی میللی .

## • كاردانەوەی ناوەخۆیی :

لەناوەخۆشدا لەكاتێكا خەلكی جەزائیر لەوپەری كەیف خۆشی دابوون وئیسلامیەكان بەدڵنیایی چاوەڕێی وەرگرتنی حوكم بوون ..لەوكاتەدا چەپ وعەلمانیەكان هاوكات لەگەڵ كاردانەوەی دووڵی دەستیان پێكرد، أحمد بن بلا و(**حزب الطليعة الاشتراكية الشيوعية**) و (**جبهة القوى الاشتراكية**)، (سەندیكای كرێكاران) و(**جبهة التحرير**)..داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجامەكانی هەڵبژاردنیان كرد، لە ١٩٩٢/١/٢ رێپێوانێكیان كرد، وە بانگەوازێك لە (حسين آيت احمد)بەو شێوەیە دەرچوو :(ئەی خوشك وبرایانی جەزائیر لە هەر شوێنێك هەن ...وولاّت بە ناسك ترین قۆناغ تێدەپەڕێت، دیموكراسیەت، كۆماری،سەربەستیەكان...هەمووی لە مەترسی دان، چارەنووسی وولاّتبەرەو هەڵدێرە).

بەو شێوەیە هەڵ ومەرجێكی دووڵی ئیقلیمی و ناوەكی ڕەخسێنراله لایەن دنیا خۆران كە لە و دیموكراتیەی شانازی شارستانیەتی پێدەكراو یەك لە درووشمە بنچینەیەكانی ڕژێمی نوێبوو لێی پاشگەز ببنەوە، بۆیان دەركەوت دیموكراسیەت، ئەو گۆڕەیە كە بەدەستی خۆیان لێی دەدەن. بەو شێوەیە نەخشەی وەرگێرانێكی سەربازی جێبەجێكرا و هەڵبژاردنەكە لە١٩٩٢/١/١١ هەڵوەشێنرایەوە و **شاذلی بن جدید** لە سەرۆكایەتی خراو، ئەنجومەنێكی بالاّی عەسكەریان دروست كردو (**محمد بوضياف**)كە لە ئەمریكا دەژیا هێنایانەوە و كردیان بە سەرۆكی ئەو ئەنجومەنەو هەڵبژاردنە دیموكراسیەكە هەڵوەشێنرایەوەو سندوقی دەنگ دان وەلانراو پۆستاڵەكانی عەسكەرتاری هاتە پێشەوە...

## • كورتەیەك لە بارەی موئەسەسەی عسكری جزائیری:

لە پاش سەربەخۆ بوونی جەزائر لە ١٩٦٢سووپای جەزائیر خۆی بە باڵی عسكری (**جبهة التحرير**) دەزانی وو لە لایەن دەستوری وولاّتیش ئەو ئەركەیان پێسپێرا، بۆیە هەر لەو كاتی زۆر كارگەریان لە سەر رەوتی سیاسی جەزائیر هەبوو، هەرچەندە سەرۆكەكانیش مەدەنی بوون بەلاّم هەر بە پشتوانی ئەو سوپایە هاتوونەتە سەر حوكمویان لادراون، لادانی أحمد بن بلا و هاتنی (هەواری بومدیان)و لێدانی (**طاهر زوبيدی**).. لە دوای مردنی (بۆمدییان)یش لە گوریس كێشی نێوان (محمد صالح

یحیی،وعبدالعزیز بوتوفلیقه) که پاڵپیواری (جبهه التحریر)بوو له گەڵ (شاذلی بن جدید)هەر سوپا بوو بووه ئەو پارسەنگەکه بەلای (شاذلی بن جدید)دا بکەویٚ ئەو ببێته سەرۆك کۆمارهەر ئه مۆریس کێشیه دەرکەوت (جبهه التحریر)خەریکه جیٚ لەق دەبێت.... له ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٩١هەر سوپا بوو له پشت ئەو بریارەی (شاذلی بن جدید) که (دۆخی نا ئاسایی) ڕاگەیاندو دەبابەکان به سەر شەقامەکان وەربوون،هەتا هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنه به ناوبانگەکەی جەزائیریش به فەرمانی ڕاستەوخۆی (جنرال خالد نزار)بوو که وەزیری بەرگری ئەوسای جەزائیر بوو بووه هۆی ئیقالە پیٚکردنی شاددلی بن جدید له سەرۆکایەتیش ، ئەو ئەنجوومەنەش به ڕاشکاوی هاته مەیدان دروست بوو له پێنج کەسە ("**محمدبوضیاف**" سەرۆك) ("خالد نزار" ئەندامێکی بەهێز) (العرب بالخیر) (**مصطفی غزیل**) ("توفیق مدین" ئەندام تیایدا). ئەو ئەنجومەنه هەر له پێشتریش به زۆری دەسەڵات وسامان دار به ناوبانگ بوون و ڕاستەوخۆ له گەڵ هەندەران له پەیوەندی دابوون. گۆڕینی سیٚسەرۆك (**محمد بوضیاف**) که کوژرا، ئینجا (علی کافی) ئینجا (ئەمین زروال) بەیەك سیاسەت، باشترین بەڵگەیئەو سەرۆکانه ئەگەر مەدەنیش بن تەنها هێمایه و ئەگینا به کردار عەسکر فەرمان ڕەوان.. قەبارەی عسکری جەزائیر پێش ئەو ڕووداوانه خۆی له٢٠٠٠٠٠سەرباز دەدا، بێجگه له جەنراڵ و سامان دار کۆمپرادۆرەکان زۆربەی پله دارو سەربازەکانی تر بەرەی (**ئینقاذ**) یان خۆش دەویست..

## بەشی پێنجەم

# جەزائیر لەدوای ئینقلاب

یەکەم هەنگاو له دوای ئینقلابی ١٩٩٢/١/١١ ئەو هەڵبژاردنه مێژووییەیان هەڵوەشاندەوە، دیاره پشتیوانیەکی به ئاشکرایش لەلاین ڕۆژئاواوه لێکرا، ئینجا هەڵسان به گرتن و زیندانی کردنی لایەن گران و سەرکردەکانی بەرەی **ئینقاذ**، بەردەوامیش بوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەزگایانەی که له ڕێگای دیموکراتیانه هاتبووه کایەوه تا هەڵوەشانەوەی ئەنجومەنی شارەوانیەکانیش بەره بەره دەستی به داخستنی ڕۆژنامه و گۆڤاریش کرد لەوانه (**منقذ، المستقبل، جزائر الیوم،...**) له بەرامبەر ئەو هەڵ ومەرجه که هەموو دەرگاکانی له ئیسلامیەکان داخست تەنیا دوو ڕێگای بۆ هێشتنەوه یان زیندانی یان وازهێنلن... ئەوانیش ڕێگای سێیەمیان بۆخۆیان دروست کرد که له قورئانی پیرۆز هاتووه **﴿ولا ترکنوا الی الذین ظلموا ..﴾ ، ﴿ وجاهدوا في سبیل الله ..﴾، ﴿ أذن للذین یقاتلون بأنهم ظلموا وأن الله علی نصرهم لقدیر...﴾ ، ﴿کتب علیکم القتال وهو کره لکم...﴾** جا ئەوەی باوەڕی تا ئەو ڕاده بەهێز بوو، که ئەو (کفر)ەی دیت بەدەست چووه ڕیزی جیهاد ئەوا دەرچوو شۆڕشی ئیسلامی جەزائیریان بەرپا کرد، ئەوەی باوەڕی لاوازتر بوو جەنگی لاناخۆش بوو ، وەدونیای لا شیرین بوو(وهو کره لکم..) ئەوا تەنیا به زمان دژایەتی ئەو (کفر)ەی دەکرد. ئەوه سەرەتای کێشەی جەزائیره و تا

ئێستاش بەردەوامە لە نێوان خەڵکی جەزائیر و حکومەتی عەسکەری، ئەو جەنگە (حرب الاهلی) نی‌یە، (مأساة جزائر) نی‌یە، (مسألة التطرف) نی‌یە، مەسەلەی(عاطلين) نی‌یە... ئەمە جەنگی نێوان هەق و ناهەقە، جەنگی شەریعەتی خەڵکی بەهەموو پیوەرێك دژی ناشەرعە، ئەوانەی چەك بەدەستن وجاری جیهادیان داوە پاڵەوانی نەبەزن، تا سەركەوتن رزگار كردنی جەزائیر لە ناشەرعیەت چەك دانانێن، چارە نووسی جەزائیریش هەر ئیسلامە، ئەگەر بە دیموكراتیانە نەبێت ئەوا بە جیهاد دێتە دی.لەسەر هەموو ئیسلامیانی جیهان، هەموو رزگاری خوازانی جیهان، هەموو دیموكراس پەروەرانی جیهان... ئەركە لایەنگری خەباتی رەوای خەڵكی جەزائیر بكات بە دەست ئەگینا بە زمان یان بە دوا تروسكەی باوەر كە دڵە.

## •گەشەكردنی كێشەی جەزائیر:

حكومتی عەسكەری جەزائیر بە خۆی و بە كۆمەڵێك پشتیوانی جیهانی‌یەوە لە روو بە رووبوونەوەی لەگەڵ شۆرشی ئیسلامی جەزائیر هەڵسا بەو پرۆسەو ئیجرایانە:-

١- بەرەی (ئینقاذ)ی حەل كرد بە بریارێك لە ساڵی ١٩٩٢.

٢- هێزی ئاسایشی زیاد كرد و دەستی بە گرتنی رەوشەنبیران كرد كە بۆ ماوەی ٧٢ سەعات (٢٠٠٠) رەوشەنبیری گرت.

٣- زیاتر دەستی بەسەر راگەیاندن داگرت و هەتا لە هەواڵەكان قەدەغە كران بێ (چاودێری) هیچ هەواڵێك بلاو بكەنەوە، بۆیە دەنگ و باسی جەنگی جەزائیر بە راستەقینەیی بلاو ناكرێنەوە و ئێستا (عمر بلوشاكی) سەرنووسەری رۆژنامەی بەناوبانگی (الوطن) حوكم درا لە ١٩٩٧/١١/٥ چونكە هەواڵی كوشتارێكی بەراستی بلاو كردەوە كە حكومەت خۆی بوو.

٤- لە ٢/مارس/١٩٩٣ هەڵسا بە پچراندنی پەیوەندی لەگەڵ ئێران وسودان گوایە ئەو دووە یارمەتی موجاهیدانی‌دەدەن.

٥- هەڵسا بە دروست كردنی میلیشیاو جاش بەجۆراوجۆری گوشار و مادەو دوژمنایەتی دروست كردن.

٦- هەڵسا بە هەندێ پرۆسەی ساختەیی هەڵبژاردن/ وەك:

١- هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی لە نیوان چوار پاڵێوراو : ئەمین زەروال ، **محفوظ نحناح** ، سعید سعدی ، نور الدین بو كروح . لە ١٦/١١/ ١٩٩٥. كە ئەمین زەروال بە یەكەم دەرچوو ٧٠٨٨٦٨٨ دەنگی هێنا .

٢- گۆرینی دەستور لە نۆڤەمبەری/ ١٩٩٦ كە رێی گرت لە دروست كردنی حزب و لایەن لەسەر بنچینەی هەرێم و توێژ و ئایین ، بۆیە (حماس) كە پێشتر (**حركة المجتمع الاسلامي**) بوو بە سەرۆكایەتی (**محفوظ نحناح**) بە گوێرەی ئەو دەستوورە ناچار گۆری بۆ (**حركة المجتمع السلمي**).

٣- یاسای (حزبەكان)دەركرد.

٤- هەڵبژاردنی پەرلەمانی كرد.

٥- هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەکان لە مانگی ١٠/١٩٩٧.

● **تێبینی:** راستی بەشدار بوان لە هەڵبژاردن دەرکەوت کە کەمتر لە (٢٠٪ )تەواوە ، ئەوەی تر هەمووی تەزویراتە .لە بەرامبەردا ئینقاژیش هەڵسا بەو هەنگاوانە بۆ پێشەو کردنی جیهادی پیرۆز:

١) دروست کردنی باڵی عەسکەری سوپای (**ئینقاذ**) بە سەرۆکایەتی (مدنی مرزاق) وە چەند لایەنێکی تریش لە ژێر ئەو باڵە:

أ- الحركة الاسلامية المسلحة.

ب- حركة الدولة الاسلامية(عبدالقادرشيوطي).

ج- الرابطة الاسلامية للجهاد الجزائري.

د- جبهة الجهاد الجزائري.

٢) هەوڵدرا لەگەڵ (الجماعة الاسلامية المسلحة) یەککگرن .

٣) هەروەها سەرکردەکانی زیندان فتوای رەوایەتی جیهادیان کرد.

٤) ژمارەی موجاهیدان زۆر زیادی کردووە لە چەند مەفرەزەیەك کە لە سەرەتادا دەڵێن ٢٠ نەفەر دوایی ٦٠٠ نەفەر بووینە ئێستالە زیادبووندایە کە دەگاتە زیتر لە (١٠٠٠٠)نەفەر .

٥) باڵی سیاسی لە دەرەوەش بەناوی (**هيئة التنفيذ**) بە سەرۆکایەتی (**رابح الكبير**) کە زۆر چالاکی گەورەیان نواندووە تا ئێستا لەگەڵ (أنور هدام، عبدالله أنسي ، قمر الدين خربات،...) قەیرانی جەزائیر بووە سەرەتایەك کە ئەو ئیدارە دیموکراتیە زوو لە گۆڕ بنرێ ، ئەوەتا لەدوای جەزائیر هەموو وولاتانی عەرەب وئاسیا و تورکیا و تاجیکستانو...هتد و زۆربەی وولاتانی ئەفریقی یان بە ئینقلاب یان بە تەسك کردنەوەی دیموکراتی دکتاتۆرە بێشکلەکەی خۆیان زیندوو کردەوە،ئەوەیان بەدەست خۆش لە لایەن رۆژئاواوە ...ئێستا بەشداری ئیسلامیەکان بە راستەقینەییلە ژیانی سیاسی تاکە پیوەرێکی دیموکراتیە.

## بەشی شەشەم

# واقیعی ئێستای جەزائیر و ... چارەنووسی

حکومەتی جەزائیر سوورە لەسەر چارەسەری عەسکەریانە بۆ کێشەکە و تا ئێستاش لەو چارەیە سەرکەوتوو نەبووە ، هەرچەندە خەڵکێکی لە کۆنە بەزیوەکانی (تحریر) وهەندێ خەڵکی بە زۆری وبەناوی (**حراس الوطن**) دروست کردوە و نەیان توانیوە هیچ ئەنجامێك بەدەست بێننەدی، حکومەت لەو ماوەیە زۆر تاکتیکی بەکار هێناوە وەك کوشتنی خەڵك و تەقاندنەوەی بۆمب و کوشتنی شەخسیات و ...هەمووی بەناوی (**الجماعة الاسلامية**) کە توانیویەتی سوود لە هەندێ فتوای خێرای

ئەوانە وەریگرێ بەڵام هەر هەمووی بۆ جەزائیر و دونیا ئاشکرا بوو . ئەوەتا لە خۆپیشاندانەکەی جەماوەری ناو شاری جەزائیر لە ڕۆژانی یەك شەممە - هەینی مانگی ١٠/١٩٩٧ هەموو بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد (**الموت للعسكر القتلة**) هەروەها زۆر بەڵگەی بێ مناقەشە و کوشتنی مامۆستای زانکۆ و کوشتنی (قاسدی مرباح) و ئیمامانی مزگەوت و...ئەوانە هەموی ئاشکرا بووینە. لە لایەکی ترەوە سەرۆکی ئەرکانی سوپای جەزائیر (محمد العماری) دانی بە لەدەست دانی کۆنترۆڵی حکومەت کرد لە زۆر ناوچە، ئێستاش موجاهیدانی ئیسلام زۆر ناوچەی ئازاد کراویان هەیە و بە ڕۆژ ڕێگاو بانە سەرەکیەکان ئەگەر بە هێمنی دەردەکەوێ بەڵام بەشەو یەك پارچە جەزائیر دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی موجاهیدان.

لە ڕووی سیاسیش ئەو ئیجرایە سەختانەی هەڵبژاردن و بەناو شەرعیەت وەرگرتن هیچی لە وەزع نەگۆڕیوە و بەتایبەتی لە خۆپیشاندانی سەدان هەزاریەکەی ٢٧/١٠/ ١٩٩٧ دژی حکومەت ولە لایەکی تر ئەو ڕێژە کەمەی (کە کەمتر لە ٢٠٪) هەمووئەو بینایەی ژێراو ژوور کرد.، ئێستاش نەخشەی سیاسی جەزائیر بەرەو گۆڕانە لە قازانجی معارەزەدایە. دەتوانین لایەنەکانی سیاسی جەزائیر بەو شێوەیە پۆلین بکەین:

- **پۆلی (١)** :- تێکڕای بەرەی ئیسلامی لە شۆڕش دان دژی حکومەتی عسکری جەزائیر.
- **پۆلی (٢)** :- بەرەی معارەزەی بێ چەك ، کە لەو حزبانە پێك هاتوون:

١- **جبهة القوى الاشتراكية** (FFS) بەسەرۆکایەتی حسین آیەت أحمد لە ساڵی ١٩٦٣ دروست بوو، ئایدیۆلۆژیای نیشتمانیسۆسیالیستە، لە ناوچەی بربریەکان بە باشی هەن.

٢- **حزب جبهة التحرير الوطني**(ELN) بە سەرۆکایەتی عبد الحمید مهری کە حزبی فەرمان ڕەوا بوو.

٣- **حركة من أجل الديمقراطية في الجزائر**(MDA)بە سەرۆکایەتی (أحمد بن بلا) ، ئەوە لە ڕەچەڵەکدا لە (**جبهة التحرير**) جیابویتەوەن لە ساڵی١٩٨٩ دروست بووە.

٤- **حزب النهضة الاسلامية**: بەسەرۆکایەتی عبداللە جاب اللە، وەش لە برایان (الاخوان) جابوونەتەوە.لە ساڵی ١٩٨٤ دروست بووە.

٥-هەندێ حزبی تر وەك حزبی(**حزبی العمال الاصيل**) لویزە حنون، (**حركة من اجل الديمقراطية والعدالة** MJD) کە (قاصدی مرباح سەرۆکی بوو).

- **پۆلی (٣)** :-ئەو حزبانەی کە دەنگیان زۆر کەمە تەنانەت لەیەك بازنە ش لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٢ دەرنەچونە ئەوا تا رادەیەك لە بەرەی حکومەت دان بەم شێوەیە!!

١-(**حزب جبهة التحرير الوطني**) باڵی بوعلام بن حمودە.

٢-( **تجمع من اجل الثقافة والديمقراطية**)"RCD" بەسەرۆکایەتی (سعید سعدی) زۆر دژی ئیسلامیەکانە و ڕۆژنامەکانیان بە زمانی فەرەنسیە.

٣-(**التحالف الوطني الدمقراطي الجمهوري** ) بە سەرۆکایەتی (رضا مالك).

٤- (حركه الحماس) به سەرۆكايەتى (**محفوظ نحناح**) دەڵێت نوێنەری برایانی ئیخوانە لە جزائیر.

٥-(**حزب الوطني للتظامن والتنمية، حزب الاجتماع الليبرالي، حزب الطليعة والشيوعية، حزب تجديد**). بەڵام لە ناو هەموو ئەمانە تەنیا (**حماس**) و (**جبهة التحرير**) بشداری حکومەتی جەزائیرن. ئێستا لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧ نەخشەی سیاسی لەگۆران دایە و زۆربەی ئەو حزبانەی بێجگە لە حزبی لایەنگری فەرمان رەوا (**التحالف الوطني الديمقراطي**) ئەوانی تر هەمووی کەوتونەتە معارەزە، چونکە فێڵیش لەو برە حزبە دەکەن کە تا ئێستا دەستیاریان لەگەڵ حکومەت گرتبوو، لە هەڵبژاردنە ساختەکەی ئەنجومەنی بەلەدیاتی مانگی ١٠/١٩٩٧ لەو ساختەییەش ساختەیی تیا کرد و هەمووی قەڵۆش کردن.

## •ئەگەرەکانی وەزعی جەزائیر و ..چارەنووسی

هەموو ساڵێك و لە کۆتایی هەر قۆناغێکی سیاسی سەرۆکی جەزائیر و جەنەراڵە عەسکەریەکان دەڵێنەوە و ئەوا شۆرشی جەزائیر بەرەو تەواو بوونە،گوایە ئەو هەڵبژاردنانە کە شەرعیەتی دەستوری بەدەست دەهێنێ بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەوانی کۆتایی دێت، وە شەریش کۆتایی پێ دێت... ئەوا هەرچی کەمێك شارەزای لە زانستی شۆرش دا هەبێت دەزانێ وانیە، ئەو هەڵبژاردنانەش کرا ، کەچی هەڵ و مەرجی جەزائیر لەهەموو کاتێك خراپ ترە، ئەوا خۆپیشاندانیش بووە کارکەرێك واتە هەر خەباتی چەکداری بە تەنها نییە و خەباتی سیاسی و جەماوەری بەدوا دێت دوای ئەوەی رژێم کۆنترۆڵی لەدەست دەدات. هەموو خەڵکی جەزائیر دەزانن کە بەرپرسانی حکومی لە قەیلاندنی رووداوەکان بێ ئاگان بۆیە بە هەڵە دادەچن لە هەڵسەنگاندنەکانیان.وایان زانی بەرەی ئینقاذ لە هەڵبژاردنی ١٩٩١ تەنها لە ٣٠٪ دەنگ دەهێنن کە چی لە ٨٦٪ ی دەنگیان هێنا ئێستاش لە قەبلاًنرنە عەسکەریەکان بە هەمان ئەندازە و زیاتریش بە هەڵەدا چوینە، سەرەرای تێك چونی نۆخی ئابووری و هەڵاوسان و گران بوونی شت و مەك و زۆر بوونی قەرزی دەولی ئەوا لە ناوەخۆش باڵی عەسکەری و باڵی زروال هەردەم لێك لە سپێرن، هەرچەندە هەندێ گۆرانکاری لە قازانجی زروال هاتنە دی، و باڵی توندی عەسکەر (کە سەرسەخت ترین تەیارن دژی ئیسلام) بەرە بەرە لە کورتی دەدەن چ بەرامبەر زروال چ بەرامبەر موجاهیدن. پیاوە بەهێزەکانی ناو عەسکەر وەك جنرال خالد نزار و عباس غزیل لادراون و ململانێیەکی ژێر بە ژێری بە هێز هەیە لە ناوەخۆیان. ئەو حزبانەی تا ئێستاش لەگەڵی بوون ئەوا بەرە بەرە ائیی دەترازێن و ئێستا هەموو بوونە موعارەزە.

لە رووی دووەلیش بەرە بەرە پشتیوانی لەدەست دەدا، فەرەنسا دوای سەرکەوتنی سۆسیالیستەکان ئێستا هەوڵ دەدا هەڵوێستی مام ناوەندی تری هەبێت کە لە چارەنووسی جەزائیر بەهەر لایەکدا لێی زیان بەخش نەبێت ، لە لایەکی ترەوە زۆر رووی درندەی حکومەت وا بەدیار دەکەوێت و لە ئەڵمانیا وفەرەنسا وئیتالیا لەسەر زاری هەندێ پەنا بەری سەر بە موخابەرات دەرکەوتووە کە ئەو تەقینەوانەی

ئەوروپا کە بە ناوی (الجماعة الاسلامیة) دەکرا، زۆریان (مخابەراتی جزائیری) بووینە. هەروەها دانیشیان بە بەشداری لەو کوشت و کوشتارەی ژن و منداڵە جەزائیریانە هێناوە بۆیە هەڵویستی ئەمریکیش گۆراوە و لەو دواییەش لە ۱۰-۱۱/۱۱/۱۹۹۷ لە فەرەنسا خۆپیشاندانێکی گەورەی خەڵکی فەرەنسا هاوکاری لەگەڵ خەڵکی جەزائیر کرا و لایەنگیری ئەو داواییەی بەرەی (ئینقاذ)یان کرد کە لێژنەیەکی دووەڵی پێك بێت بۆ لێکۆڵینەوە لەو کوشتارەی هاوڵاتیان و لە ڕۆژی ۱۹/۱۱/۱۹۹۷ بە فیعلی ئەو لێژنە دووەلی‌یە بڕیاری (الامم المتحدة)ی بۆ دەرچوو، وە حکومەتی جەزائیریش زۆر پێی ناڕەحەتە. ئەو دۆخە بەو ڕووکارە وا بڕوا وا پێدەچێ زیاتر خەڵکی جەزائیر هان بدات بۆ تەقینەوە و دوور نیە هەر ئەو میلیشیایەی بە زۆری چەکداری دەکات وەك ئەفغانستان و لە کوردستانیش ڕوویدا دووبارە ببێتەوە و لەجەزائیریش ڕاپەڕینێك بکرێت و شەرعیەت بگەڕێتەوە چونکە ڕاپۆرتی زۆر باوەڕ پێکراو وا دەردەخا. بێجگە لەو کۆمەڵە جەنەراڵە کۆمپرادۆرەکان لە ئاستی عەقید بە پلەی خواروو زۆر هاوسۆزن بۆ بەرەی (ئینقاذ) و ئەوانە کوڕی ئەو میللەتەن کەوا لە ٨٦٪ ی دەنگی میللەتن، بۆیە بەردەوام فیرار کردن و پەیوەندی بە موجاهیدان بەردەوامە و ڕێکخستنەکانی ئیسلام دیوارەکانی سوپای بڕیوە.بۆ یەکەم جاریش ئەو ساڵە جنرال (محمدالعماری) لە ۳۰/۱۰/۱۹۹۷ لە شاشەی تەلەفزیۆن لەدوای خۆپیشاندانەکانی جەماوەر ڕای گەیاند کە سوپای جەزائیر زۆر شوێنی جەزائیری لە کۆنترۆل دەرچووە. واتە کەوتۆتە ژێر دەستی موجاهیدان ڕەنگە ئیدی گۆڕانکاری نەوعی لە هێرش وچالاکی عەسکەری وجاهیدان بێتە دی و زیاتر سەرکەوتن بە دەست بهێنن.

## • هەڵ و مەرجی بزوتنەوەی ئیسلامی لە جەزائیری ئێستا

لە جەزائیردا وەك زۆربەی شوێنەکانی جیهانی ئیسلامی سێ تەییاری ئیسلامی سەرەکی لێ خەمایوە: (هەرچەندە بەڕێز د:قرزاوی کردوویە بە چوار تەییار لە هەموو شوێنێك بەڵام وابزانم تۆزێك بە هەڵە داچووە لەو بارەیەوە)

۱- تەییارێکی زۆر توند جگە لە جەنگ و توند و تیژی چ ئامرازێکی تر بە شەرعی نازانێ بۆ گەیشتن بە ئامانج، خۆشی بە تاکە کۆمەڵی ئیسلام دەزانێ بۆیە چەپ وڕاست دەست دەوەشێنێ و فوتوای توند دەدات، لای ئەو تەییارە (موازنە) نی‌یە هەمووی کوفرە، زۆر دوژمن و زۆر خائین لەگەڵ هەڵەیەك وەك یەکە، تا ئەو ڕاددەیە کە لە جەزائیر بەرەی ئینقازیشیان پی لە بەرەی دوژمنە ئینجا ئیران و سودان و...هەتا سەرکردە بەند کراوەکانیش پێ بە لەئیسلام دەرچوویان دەزانێ. بۆیە لە چالاکیە جیهادیەکانیان هەر وەك لە حکومەتیان داوە لە حزبەکان و لە ڕەوشەنبیرو پەیامنێر و فەرمانبەری سادە و لە ترسنۆك وبێ تاقەت لە ئیسلام دانیشتووە هەتا لە بەرەی ئینقازیشیان داوە. ئەو هەنگاوانەی (الجماعة الاسلامیة المسلحة) دیارە لە خۆڕانیە بەڵکو دەقی قورئانی لەسەرە، بەڵام نازانی لە قوە و شوێنی خوی بەکار بهێنرێ، لە ڕاستیشدا زۆر دلسۆزیشن بۆ ئیسلام بەڵام بەبێ حیکمەتن، جم و حوڵەکانیان، هەڵویستەکانیان، ئەو نیشانانەی پێوەیە:

أ) لە ئاسۆیەکی تەسك هەڵدەقوڵێ.

ب) یەك لایەنیە.

ج) قووڵنیە.

د) ئەنجامەکانی لیك نەدرایتەوە. بویە شارەزایی وئەزموونی سیاسی کەمە و خاوەنەکانیان ناتوانن وەك کۆمەڵگەی(الصحابە) رووداوەکانی دەولی و ئیقلیمی و ناوەخوی پیك وەببەستنەوە.هەر بویەش ئەو جۆرە جم و جۆڵە زۆر خزمەتی ئەخشە و پیلانی حکومەتی جەزائیری کردووە. لەوانە:

ا) زۆربەی حزبە عیلمانیەکان و کەسایەتی‌یەکانی جەزائیر ئەمانی خویان لەلای عسکر دەدۆزنەوە.

ب) چەکداریتی زۆری خاش بو حکومەت پەیدا کرد لە کاردانەوەی ئەنجامەکانی هەرەشەی جماعە.

ج) دووبەرەکی‌یەکی گەورەی خستۆتە ریزی موجاهیدان.

د) حکومەت ئەو توندی‌یەی قۆستیتەوە و لە پەنایدا هەلساوە بە کوشتنی زور لە رەوشنبیران و پەیامنیر و ئیمام و تا لیپرسراوە حزبە نارازیەکانیش. ئیستا وا ژن و منداڵیش هەر لە پەنای هەرەشەی جماعە دەکوژن.

ه) بەکورتی حکومەت چەندین هەنگاو دەپیکی بەو رەفتارانەی ئەوان، لە لایەك ناو زراویان دەکات لە لایەکی ترەوە دوژمنی خۆشی لەناو دەبات. بەو شیوەیە جۆرە بی سەروبەری‌یەك دروست بووە لە ریزی موجاهیدان و گۆرەپانی جەزائیر، هەتا تیوریك لەلای خەڵکی دروست بووە کە دەستی حکومەت کەوتۆتە ناو (**الجماعة الاسلامية المسلحة**) بەلأم نکولی لەوە ناکری کە ئەوانە گەنجی خوین گەرمی دڵسۆزن. تەییاری دووەم: تەییاریکی زۆر نەرم کە هەموو شتیکی قەبوولە لە جەزائیر(حماس) بە سەرکوردایەتی (**محفوظ نحنـاح**)مێتشەنگی ئەو تەییارمیە، ئەوانە تەییاریکی کلاسیکی لاوازن بەرەو کریش دەروا، راو بۆچوونەکانیان زۆر تەك و لویە و جیگەی داخە، لەپاش ئەو هەموو ئەو راستیانەی جەزائیر کە ئەوروپا و ئەمریکاش نکولی لیّ ناکەن، کەچی ئەو تەییارە هەر رەئیان لەگەل حکومەتە و تا ئەو رادەیە وەك شیوعی‌یە جاشەکان حیساب دەکرین، بەشدارن لەو حکومەتە بە وەزارەت هەتا حزبە عَلمَانیەکان بیزاریان لەو بەشداریە دەبیتەوە، ئەوانە بەرگری لە هیچ (منکر)یك ناکەن نە بەدەست ونە بە زوبان و پی ناچیت بە دڵیش، بۆیە ئەگەر ئەوانە لە خانەی ئیسلام حیساب بکرین لەو پەری دان لەسەر سنوورن {**....وليس وراء ذلك حبة خردل من الايمان**}.

٣- تەییاری سێیەم تەییاری بەرەی **ئینقاذە**، کە تەییاریکی رەوشەنبیر و ناوەندگری هەردەم بو هەموو شتیك توند نی‌یە وەك (**الجماعة الاسلامية**) نە ئەوەندەش نەرمە هەردەم بۆ هەموو شتی وەك(حماس)، کە لە راستیدا لە هەموو جیهان دوژمنانی حیساب بۆ ئەو تەییارە دەکەن کە لە هەنگاوەکانیان دوور بین و بە مەسئوایەتن، لە سنووری حساباتی شەرع و قووڵایی حیکمەت و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی و هەمەلایەنیەکی وورد بینن، لە جیهاندا هەر ئەو تەییارە لیی رەچاو دەکری لە زیادبوون دانە و تا ئیستا ئیران، سودان، چیچان،بەرگریەکانی جیهادی حواررووی لبنان، فلسطين. کشمیر،تاجیکستان، فلپین،...هتد لەو تیرازەن لە ئەفغانستانیش تەییاری

(تالیبان)نوینەرایەتی کلاسیکیانەی تەیاری توندی یەکەم دەکات و بەرەی ئیسلامیش نوینەرایەتی تەیاری سێیەم دەکات، تەیاری دووەم نمونەی هێشتانیە.

## هەڵ سەنگاندنێکی خێرا:

سەرنجی خوێنەری کوردی بەرێز رادەکێشین کە زەمین بدەنە ئەو تێبینیانە لەسەر هەلومەرجی دۆخی ئیسلامی جەزائیر کە ووڕ لایان دێك چووە(یان راستەوانە یان پێچەوانە) لەگەڵ دۆخی ئیسلامی لە کوردستان وا بە کورتی باسی دەکەین:

١- تەیاری یەکەم تەیارێکی دڵسۆزە و لەخۆ بووردەن ئەوی دەیکەن بە بەشێك لە تەقوای دەزانن و هەر واشە و لە بەشی یەکەمی هاوکێشەی ئەو فەرمووودەن:﴿من رأى منكم منكرا فليغيره بيده...﴾ دیارە لەو هاوکێشەیە بەشی یەکەم هەرە باوەردارەکەیە و بەشی کۆتاییشی ئەوەی هەرە لاوازەکەیە. بەڵام ئەوانە نەیان پێکاوە و بەشــی زۆری لــە جم وجۆڵــەکانیان بــێ ویستی خۆیــان لــە خزمــەتی نەخشەی دوژمنانە، دوژمن دەیەوێ خەڵکی، کەسایەتی ، لایەنی تر...لە گەڵت تێکەڵ نەبێت بۆ ئــەوەی ژێــر خــانی سیاســی بتــەو دروســت نــەبێت، یــەکێ لــە ئامانجــەکانی پێغەمبــەر (ﷺ) لــە رێکــەوتنی (حودەیبیە) تێکەڵ بوون لە گەڵ خەڵکی لە جەنگی پرۆپاگەندەی چەواشە رزگاریان بێت ونیعمەتی ئیسلام وپەیوەندی نێوانیانببینن. عادەتی ئەو جۆرە رێبازە توند گرتنە دەبێتە هۆی زۆر ناکۆکی لە گەڵ دەوروبەر هەتا ناوەخۆیشی وزوو گەرم بوون زووش ساردبوونەوە، هەمان دەردی چەپی نوێ بوو کە ئەوانیش لە یەکێتی سۆڤیەت وچین وماوو ستالین... هەموویا پێ‌تحریف بوو هەر کۆمەڵە تەنها خۆی پێ‌راست بوو، ئینجا زووش ساردبوونەوەو لێك ترازان، وەك (فدائی خلق)وابوو، وەچەپی (فلسطین)وابوو، چەپی کوردستان وابوو...هتد، جا ئێستا (جماعەی ئیسلامی مسلحە)ی جەزائیر هیچ کەسیان پێ‌راست نیەو هەتا (جماعەی ئیسلامی مصریش)یان پێ‌تەواو نیە کە هاوبیری یەکیشن.

٢-ئیختلافی راوبۆچون و کێشەی سەرەتایی وئنجا دروست بوونی فرەلایەنیئیسلامیو چوونە ناو بابەتی دوور لە واقیعی ئێستا..هەموو ئەوانە سەرچاوەی زیانی گەلێ گەورەن بۆ کاروانی پیرۆزی ئیسلام، نمونە مێژوویمان زۆرە و، دەولەمەندیشین لە نمونەی ئێستا ئەوەتا ئەفغانستان، جەزائیر... بۆیە بە پێچەوانەی ئەو مامۆستا بەرێزەی کە لە کتێبی (سیستەمی سیاسی ئیسلام)و هەندێ زانای تر کە رێیان داوە بە تەرازووی شەرع بە فرە لایەنی لە چوارچێوەی ئیسلامی... نەخێر تا بڵێ‌ی ترسناکە و هیچ بەڵگەیەکی نەقلی وعەقلی نیە لایەنگیری لەو بۆچوونانە بکات و بە پێچەوانەش زۆرە. لە بارەی تەیاری دووەمەوە بۆ ئەوەی لە کوردستان هەڵوێستی نحناحی دروست نەبێت واچاکە سەرنج بدەینە تێبینی سێیەم:-

٣- لە تەیاری دووەم دەڵێن ئێمە میان رەوین... کوا ئەوە بەرەی (انقاذ) دەتوانرێ پێی بگوترێ میان رەوە لە نێوان تەیارێکی زۆر توندو شۆرشگێر و تەیارێکی نەرم وشلی ئیستسلامی... جا رووی پرسیارمان لەوانەیە ئاخۆ ئێوەی تەیاری دووەم چ لە جەزائیرو چ لە کوردستان کە دەڵێن میان

رەوین لە نێوان کێو کێ ؟؟.. یا چەند ساڵی تر وەڵامان بۆ بنێرنەوە... ئەگەر هەر نەرمی و ئیدارە کردن بە هەر چۆنێك بێت میان رەویە ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) میان رەو نەبووە.

٤-مەسەلەی هێزو خۆ توندکردن ئەوەیان یاسای ژیانە و سوننەتە گەردوونیەکان بناغەیەتی، زیاتر لە ٣٠٠ ئایەت داکۆکی لە سەردەکات، لە واقیعیشدا هەروایە دەوڵەتی بەهێز، کۆمەڵی بەهێز، شەخسیەتی بەهێز...دوورە لە فتنەش، بە پێچەوانە حەڵکی بێهێزهەردەم مافی دەخورێ..

٥- هیچ نموونەك نە لە جیهانی گەورە نە لە جیهانی ئیسلامی نەبووە بەو رێگایە هەر نەرم وپارانەوە گەیشتبنە ئامانج، هەڵبەتە هیچ بە ئەندازەی ئیسلام لە ئاشتی نەگەیشتووە، خۆشی خاوەن دروست کردنیەتی، بە پێچەوانەی مارکسیەت کە ئامۆژگاریەکەی بە ناوبانگە کە دەڵێت:-(ئێوە هەردەم شۆرشگێر بن ئیسلاحی مەبن) لە سەرمایەداریشدا دوو جەنگی جیهانی رووی دا بەلأم مانای ئەوە نیە لە ئیسلامدا ئەگەر شەقێکیان لەو لایەدا لا رووەمەتەکەی ترت بۆ وەرگێری وەك لە (ئینجیلی دەسکاری کراو)هاتووە،ئەوەیان بۆ بەشێك لە ئادەمیزادی بە ئەخلاق راستە بەلأم بەشە زۆرەکەی تر (کە ئێستا ئەوان زاڵن بە سەر دونیا ) هەر کاتێك بینی ئەوا لارووەمەتەکەی ترت وەرگێراو بەرگریت نیە، ئەوا لە جیاتی لێت ببورێ بە مست وشەق دەکەوتە سەرت، ئەگەر ئەو درەختەی بە گاشە بەرد میوە بۆ بەردایەوە ئەوا درەختەکەش لە بن رادەبرنەوەو دەیگۆزنەوە ناو کێلگەی خۆیان...ئەوە یاسایە موناقەشە هەڵناگرێ، بە دەیان ئایەت وفەرموودەشی لە سەرە، ئیدی بدیلی ئەو راستیەش تەنها خۆ هەڵخەڵەتاندنە.

٦- جا رەووتی ئەو ئەزموونی وایە بە ئەنجامێکت دەگەیەنی وەك حزبی شیوعی کۆن هەر دەبوایە پینە بۆ دنیای شیوعیەت بکات و نەشدەکرا، لێرەشدا هەمان ئەنجامە چونکە رەوتەکە هەڵەیە جا هەر پینەی رووداو گوفتەو کردە دەکەن ، وناکرێ، لە رۆژنامەی یەکگرتووی[1] بەرێز ژمارە(٦٩)لە ١٩٩٥/١٢/١دیار بوو دەیوویست پینە بۆ بەشداری (محفوظ نحناح) بکات و حکمەتی بۆبدۆزێتەوە، کە بۆچی بەشداری لە هەڵبژاردنە ساختەکەی کردووە، لە دوایدا ئەو هەموو راستیان ، بە(رەنگە)دەستی پێکردبوو لە هەموو خاڵەکان (رەنگە نحناح بەشداری کرد چونکە....)هەموو شارەزایانی رۆژنامەوانی دەزانن(رەنگە)واتە زانیاری ئیحتمالیە، تەواو زانیاری نیەو لە هەموو پینەیەك گەورەترە..

٧- (محفوظ نحناح)تاقی (تاقی کراوە)دەکاتەوە هەتا ئەوەی بە سەریش چووە. لەوەی سەیر تر(محفوظ نحناح)بەشداری لەوپەیمانە کرد(پەیمان نامەی وفاق الوطنی)کە لە ١٩٩٦/٩/١٥ کرا کە تیایدا ئەوبەندە کۆنە رزیوەی (دەوڵەت جیایە لە ئایین)ئیمزایشی لەسەر کرد ،عبدالسلام راشدی نوێنەری (جبهة القوی الاشتراکیة)نەك (ئی ئیسلامیەکان )لەوەسفی ئەو کۆنگرەیە ووتی...(تەنیا کۆنگرەی جبهەی تحریری بوو چیتر نا نازانم چۆن ئیسلامی بێت عزمتی هەیە بەشداری بکات) لەوەش خراپتر (محفوظ نحناح)لە ئاخاوتنێکی دا لایەنگیری ئینقلاب دەکات و دەڵێت:-((ئەگەر

[1] نووسەر رای خوی بوو.

رەوتی هەڵبژاردنەگیرابایە رەنگە ووڵات بەرەو هەڵدیر برۆیشتابایە ترسناک ترلە سەربرینی یەکتری بورۆندی))"گوڤاری المجتمع ل٦٩ ژ ١٢٦٠ ساڵی١٩٩٧" کە بواری هیچ پینەو و "رەنگە"یەکێ نەهێستەوە.بۆیە (عباسی مدنی)لە وەسفێکی بەناوبانگ (محفوظ نحناح)دا دەڵێت:(ئێمە لە تەنگانیەکدا لە نحناح دەگەراین، ست لویزەمان دۆزیەوە.( هیچ رێیەك نەماوە تاقی نەکرێتەوە ، ئەوەتا بەرەی ئینقاژی ئاشتی خواز هەموو دەرگاکانی لەسەر داخرا. جاچی بکات وەك د.یوسف قرچاوی گۆتەنی، نابیت لە(لومه لائم) بترسیین کاتی خۆشی کە پێغەمبەر ﷺکەجاری جیهادی بەرگری دا خەلکێکی زۆر لەخزم وشەخسیەت پیان گووت: کەرەستەی خۆت و تەکنەلۆجیای فارس و رۆم زۆر لێك جیایە، بەلام خۆشەویست پێی فەرموون: تەکنەلۆجیای ئێمە (اللەاکبر)ە گەورە ترە لەهی ئەوان. ئەوچەکەش ماوەو هەر بەو چەکەش شای پێ رووخا کە ئەمریکای لەپشت بوو ئەفغانستان وچیچان گەورەترین سوپای ئەو جیهانەیان بەچۆك داداو سودانیش هەر بەو چەکە وا بەرگری دەکا،نابێت ئەوەندە دنیامان خۆش بوێت (رأس کل خطینة)، گریمان (محفوظ نحناح) لەو هەڵبژاردنە دەریش بچووبایە، ئەدی بەرەی (ئینقاذ)دەرنەچوو، چارەنووسی تەیارەی (محفوظ نحناح) دۆراوە لە هەموو ئەگەرەکان، چ ئیسلامیەکان بە تەواوی سەرکەوتن چ حکومەت.

٨- ئەو برە دەنگە محفوظ نحناح (١٤×٢١/١٠٠=٢،٣ دەنگی راستەقینە)واتە لە ٢٪ی هێناوە باشترین وەلامە جێگەی هەلوێستە بۆهەموو جیهان-کە ئەو رەوتە بەو شێوەیە ئەوە تەرازوویەتی و لە رووداوەکانی نوێی جیهان بەجێماوە

٩-دەبێ بێ دوو دلّی ئەوە بزانین ئەو ناوانە (ئیرهاب)و (مطترف)و(ئصولی)و....هەموو لە جەوهەردا مەبەستیان دژاتی کردنی ئیسلامە ، خۆ تۆمەتی و ناوی تر لە پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاه والسلام) وەك (مجنون)و(مفسد)و (شرذمة قلیلون)...جا خۆ جیا کردنەوە بە ناوی (معتدل) دادنادا، هەموویان پێ وەك یەکە، ئەوەتا هەر لە جەزائیر (سعید سعدی)ووتی: حماسیش هەروەك ئینقاژ)هێلکەی یەك سەڵەن وتامیان یەکە تەنیا قەبارەیان جیایە، ئەوان بەو جیابوونەوەیە ئەو گفت ولفتە نەرمە ماستاویە لێتان رازی نابن هەتا تەواو واز لە ئیسلام نەهێنن﴿**ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم قل ان هدى الله هو الهدى ولئن اتبعت اهوائهم بعد الذي جاءك من العلم مالك من ولي ولا نصير**﴾.

بەشی حەوتەم

# چەند هۆیەکی ناوەکی بۆ دواکەوتنی سەرکەوتن

لە ڕاستیدا کە گەلی جەزائیر دەستی بەجهاد کرد وارانە دەبینرا ئەوەندە بخایەنێ، بەتایبەتی لە
ﺳالانی ١٩٩٤-١٩٩٥ هیئەی تنفیزی لە دەرەوەو سەرکردایەتی زیندانیش بی ترس جار یان دا کەئالأی
ﺳلام لە کۆتایی ١٩٩٥ان شاءالله لە جزائر سەر بڵندانە دەشەکێتەوە، شارەزایانی ڕۆژئاواش زەنگی
ﻣترسیان لێداو زۆرجار بەبیرو گفتە باسی حیواریان دەکرد لە گەڵ موجاهیدان وەك بدیلی
ﺳۆگەربۆ حکومەت، کەچی تا ئێستا ئەو سەرکەوتنە نەهاتە دی. دیارە کۆمەڵێك هۆی خۆی هەیە
ﺭوەلی وئیقلیمی وناوەکی، ڕاستە لە یارمەتی عسکری وئابووری وسیاسی ومعنوی و... شارەزای
ﺳکری وبیانی و بە ئاشکرا مصرو تونس وفرنسا بەشداری لە وجەنگە دەکەن، وەك بەڵگە لە چالاکیە
ﻟەوانیەکەی (سیدی موسی) لە٨/دیسمبری/١٩٩٤ (٣)سەربازی تونسی کوژران وتەرمەکانیان بۆ
ﻧس ڕۆیشتەوە ، وانیشان دراو بڵاوکرایەوە بە ڕەسمی کە ئەو سەربازانە لە صۆمال کوژراون، بەڵام
دوایدا هەر ئاشکرابوو. سەرەرای هەموو ئەوانە ئێمە جهادی گەلی ئەفغانستان وچیچانمان بینی بە
ﻪکی سادەو بەرەنگاری گەورەترین سوپای جیهان بوونەوە، تەمێشیان کردن بۆ گەلانی تریش کە
ﺳەردەمی پەرەسەندنی تکنلوجیای چەك مەگەر ئیسلامیەت نەبێت بە عەلمانیەت ئەو بەرگریە
کرێت، هەربۆیەش لە جیهاندا هیچ معارەزەی عەلمانی نەماوەو لە جزائیریش هەرئەو هۆیەیە کە لایەنە
ﻟمانیەکان بەشداری بەرگریان پێ ناکرێ. جا بابزانین بە کورتی ئەو هۆیانە چین کە ئەو جیهادە
ﺭوزەی جزائر بە ئامانج نەگەیشتووە(بۆپەند وەرگرتنیش لە کوردستان):
دەردی هەموو دەردان دروست بوونی دووبەرەکی بە تایبەت لە نێوان بەرەی ئینقازو جەماعەی
ئیسلامی، دیارە ئەوە بەرهەمی سیستەمی فرەلایەنی‌یەو و کە سەرەتاکەی لە(ئیختلاف) دەست
پێدەکات وکۆمەڵێك زیانی کوشندەی هەیە وەك یاسای سەرکەوتنێك وتێك شکانیش ئەوەتا قورئانی
پیرۆز دەفەرموێ (ولاتنازعوا فتفشلوا...) بۆیە زیانی ئەوەندەزۆرە ناژمێرێ وابەکورتی هەندێکیان
ﺩەڵێین:-
ﺑی فەرمانی خوایە و دەیان ئایەت وفەرمووده وقسەی پیاوچاکانی لە سەرە.
ﺋیختلاف دەبێتە لێك ترازانی دڵ وجیایی ڕێبازو دوایش جیایی کۆمەڵ وجەنگی نێوانیان.
لە ئیختلاف ئامرازو ئامانج دەگۆرێن لە کۆتاییدا (کومەڵەکە) دەبێتەئامانج نەك ئیسلام.

هەروەهەم کۆمەڵی دووەم کە دروست دەبێت لە سەر ڕەخنەو سلبیاتی یەکەم پەروەردەکەی خۆی ... دەبی ئەوەی دەرگایی غەیبەت وبووختان ورەخنەی تێکدەرانەو..هەموو دیاردە نائیسلامیەکان دەکریتەوە.
ه-خەڵکێك لە سەر حسابی ئەو ئیختلافە سەردەکەوێ بۆ ناوەندی گرنگ شایستەی نیەو ڕەنگە دەستیش بێت.و-هەنجەت بە خەڵکێکی دنیا ویست دەدات کە بەشداری جهاد نەکات.
ز- بە ئەزموونی وورد سەلمێنراوە لە نێوان ئیختلاف و خزمەتدا هەریەکیان دەکرێت.
و- زیانی تری گەلی زۆر هەیە لێرەدا بوار نیە، بەڵام هیچ کۆمەڵێك بە ئامانج نەگەیشتوون و ئیختیلاف وململانێشیان هەبووبێ.
٢) لە هۆیەکانی تری دواکەوتنی سەرکەوتن و سارد بوونەوەی جیهاد هەست پێکردنی موجاهیدانە بە کەمێك دوودڵی و زۆر داوای گفت و گۆ کردن لەلایەن بەرەی ئینقازەوە کە زۆر جار شەرعیەت بە هەنگاوەکانی حکومەت دەدات، هەریەکە لە عباس مدنی، علي بن حاج، رابح كبير، أنور هدام، مدنی مرزاق نامەی جیا جیایان بۆ أمین زروال نووسیە بۆ گفت و گۆ.
٣) هەندێ هەڵس و کەوتی (الجماعة ألاسلامیة المسلحة) وە بەخێرایی فتواو بەتایبەتی فەرمان بە (تکفیر و کوشتن) بازنەی دووژمنایەتی زۆر فراوان کرد یارمەتی قەرەباڵغی بەرەی خکومەتی دالەدەرەوە و ناوەوە چ وەك نەفەر چ وەك لایەن، هەروەزها مخابەرات ئەو دەرفەتەی توندی (جماعەی ئیسلامی) قۆستەوە بۆ دروست کردنی میلیشیای چەکدار وەك(جماعە)وتاوانی گەورە بکات بە هەرەشە و کوشتنی ڕۆشەنبیر و ناحەزانی حکومیش، هەتا دوای وا ژن و منداڵیش دەکوژن کە لە گەردەنی ئیسلامیەکان دەئاڵێنرێ.
٤) لێرەش هۆیەکی گشتی هەیە لە هەموو کێشەیەك کۆمەڵێك هەن وەك ئیمامی عەلی پێی ووتن:(**خذلوا الحق ولم ینصروا الباطل**) هەندێ لە ئیسلامیەکان دەرنەچوون وەك (حزب النهضة) بە سەرۆکایەتی عبدالله جاب الله لەوەش خراپتر (حماس بەسەرۆکایەتی (محفوظ نحناح) بەوەش نەوەستا بەتاقی تەنیا بەشداری بەوەزارەت لەو حکومەتە نا شەرعیە کردوو بۆیە لە کۆنگرەی ڕۆما دەرکرا.

## دیاردەی کوشتن و بڕی منداڵ و ژن:

هەموو میلەت بکوژن چونکە دەنگیان داوەتە دوژمن (مبدأ بریخت) لە سەین وبەینی جەنگی نێوان مجاهدان وحکومەت دا زۆر دیاردەی نوێ لە لایەن حکومەت پیادەکرا، لە هەموویان نوێتر کوشت وبڕی ژن ومنداڵ بە دەگمەن لەهیچ شوێنێك وێنەی نەبووەراگەیاندنی زاڵی جیهانیش ناحەقانە ، یان لێڵی دەکات ویان بەمل ئیسلامیەکانی دادێنیێ، دیارە ڕۆژنامەکانی کوردستانی خۆشمان ڕاستەوخۆ دەنگ وباس بە فتۆکۆپیانە ومردەگرن، لەومیان کەمتر گلەی دەکرێت بەڵام هەندێکیان وەك ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان) و ڕادیوۆی دەنگی کوردستانی ئێران ورۆژنامەی کوردستان کوردستانی نوێو...لە شیکردنەوەی ڕووداوەکان زۆر بە هەڵەو چەواشەوە لەو مەسەلەیە گەیشتوون،بۆیە بەچاکی

دەزانین ئەوبەڵگانە بخەینە پێش چاو کە موتلەق ئیسلامی نین وحکومەت خۆیەتی،ئەو مەبەستی لە بنچینەدا ئەو ژن ومندالانەی پێ سەردەبڕێ نەیەتە دی:-

١-جارێ لە پێشدا دەبێ زۆر ووریا بین کە حکومەتی جزائیر بە ناو بانگە لەوەها تاکتیك، وبلاوکردنەوەی بەیان بە ناوی جەمەعاتان ودروستکردنی جەمەعات بە ناوی جیاجیا، جار وابووە سەرکردەیەك شەهیدکراوە کەچی بەیانی بە ناو بلاوکراتەوە، وەك مەسەلەی (شەهید عبد القادر شبوطی).ئێستاش رۆژانە بەیان بە ناوی (جماعة الاسلامیة) بلاودەکاتەوە بەپێی بەرژەوەندی خۆی و بە ئەدەبیاتی ئەو جەماعەتە، دیارە هەندێ هەڵس وکەوتی جەماعەتیش یارمەتی دەرینە.

٢-زۆربەی ئەو قەسابخانانەی دەکرێت دژی ئەو خەڵکەیە کە جەماوەری بەرەی نینقازن..

٣-لەو ناوچانە دەکرێ کە لە ژێر کۆنترۆڵی موجاهیدان دا نیە بە زۆریش لەنزیکسەربازگە یان ناوەندێکی حکومی کراوە کە هاواری لێ قەوماوانی گەیشتێ وتا ئێستا یەك کەس نەگیراوە.

٤-ئەو چەکدارانەی بەو قەسابخانەیە هەڵدەستن بە زۆری بێ چەك وبێ منەتن لە حکومەت .ماوەیەکی چاکیش دەمێنەوە .

٥-لە قەسفەکەی بلیدا سەرەتای مانگی١٠/١٩٩٧زیاتر ئەوە روون بۆیەوە کە حکومەت خۆیەتی ، چونکە سەربازگەیەکی گەورەی لە تەنیشتە بۆ لە سەربازگە کە لادراو گوللە تۆپەکان هەمووی بە ناو شاری کەوت ؟حکومەت لەوەلامدا گوتی ئەوە ئیسلامیەکانن گوللە تۆپەکانیشیان (صنع محلیة) بویە بە ناو خەلك دەکەوێ بەلام نەیزانی یەك لە گوللەکان نە تەقیبووە وە لەکاتی لە بەر چاوی ئەو هەموو پەیامنیرو رۆژنامە نووسە خەڵکی بلیدا نیشاندرا کە گوللە تۆپەکان هاوەننو لە نزیکەوە هاویشترابوون ئی حکومەتیش بوو(صنع محلی)نەبوو.

٦-ئۆبزێرڤەری بەریتانی لە رۆژی ٩/١١/١٩٩٧لە موقابەلەیەکی لەگەل (یوسف الجزائری)کە سەر بە موخەبەراتی جەزائری بوو رای‌کردبوو دانی بەهەموو ئەو کوشت و کوشتارە وا هێناوەە دوو نەفەری تریش رایان کردووە لە ئەڵمانیاو ئیتالیان هەمان راستیان دوپات کردۆتەوە.

٧-لە هەلاتوەکانی رزگار بووی لەو قەسابخانانە زۆربەیان هەندێ نەفەریان لەتاوان باران ناسیوە کە سەربە موخابەراتن، هەتالە(حوار مع الغرب)ئەلقەی کە لەسەر جەزائیر بەسترا لە سالی ١٩٩٧نیشاندرا لەو پرسیارەی کە لە (محفوظ نحناح) کرا لە لایەن هاولاتیەکی جەزائری.کە ئاخۆ کێ لەو تاوانانە بەرپرسیارە کاك (نحناح)هەر دەیگووت غامزەو دیار نیە،بەلام هاولاتیەك گووتی ئەدی (عقیدحسین)لە موخابرات نە ناسرابۆیەوە لە قەسابخانەکەی (سیدی موسی)،هەروەها ئەو ئافرەتە فرنسی لە بلیدا بە چاوی خۆی بینیبووی کە چۆن حکومەت گەنج ومنالی ٤سالی سەردەبری‌لە رۆژنامەی (لۆمۆند)یش بلاوکرایەوەو ئامادەشە هەموو دەم شایەدیش بدات.

٨-ئێستا ئەو مەسەلەیە زیاتر روون بۆتەوە.سووپای نینقاذ لە سەر زمانی مدنی مەرزاق.لە سەرەتای ١٠/١٩٩٧شەری یەکلایەنە راگرت بۆ ئاشکراکردنی ئەو تاوانانە ئینجا داوای لێژنەیەکی دووەلیشی کرد بۆ لێکۆلینەوە،جارێکی تریش لە١٢/٩/١٩٩٧داوای کردەوە وا دیارە بەلگەی تەواوی هەیە کە موحابراتە .

٩-ئێستا ئەو لێژنەیە وا پێك هاتووەدوای ئەوەی خۆپیشاندانێکی گەورەی بە هاریکاری گەلی جەزائیرییە لە لایەن خەڵکی فەرەنسا کرا لە ڕۆژی ١٩٩٧/١١/١٦بڕیاری (امم المتحدة)ی بۆ دەرچوو .هەروەها زۆر لە ڕێکخراوە مرۆڤ دۆستەکان پەنجەی تاوان بۆ حکومەت درێژدەکەن .بەتایبەتی ئەو بەیانەی مانگی ١٩٩٧/١١بە ئاشکراتر حکومەتی تاوان بار کرد.

١٠-ئێستا عومەر بلوشاگی سەرنوسەری (الوطن)ی زمان حاڵی فەرمان ڕەوا لە١٩٩٧/٤/٥زیندانی کرا چونکە نووسیبووی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی دەکوژرێن زۆربەیان لە لایەن موخابراتەوە .

١١- خۆ لە دوای خۆ پیشان دانە دەیان هەزارەکەی جەزتنێر کە لەسەر داوای حزبە نا ڕازی یەکان ئەنجام درا لە ڕۆژانی ٢٧-١٠- ١٩٩٧هاوواریان دەکرد (الموت للنظام القتلة) کە ئیشارەیە بۆ ئەو تاوانە. لە ڕووی عەقیدەشەوە: هەموو لایەك دەزانن کە ئیسلامیەکان زۆر دڵسۆزن بۆ ڕێباز و مەبدەئەکانی هەر بۆیەش ئەوەندە بەربەرەکانێ دەکرێن ، دیارە هیچ دەق و فەرمودە و ووشەیەك نی‌یە کە ژن و منداڵ بکوژێ هەتا ئی دووژمنیش مێژووی کاروانی ئیسلامیش باشترین بەڵگەن، هەتا لە تۆڵەش تیای نی‌یە. بەڵام هەندێ لە مەفرەزەکانی (الجماعة الاسلامية) گەلێ جار هەڕەشەی وایان ناردووە لە تۆڵەی ژن و منداڵی شەهید کراوی خۆیان، هەندێ فتوای وا باسی لێوە کراوە.. مخابەراتیش زۆر بە ووردی قۆزیتیەوە.

**•ئامانج لەو کردەوەیە:**

ئامانجەکە زۆر ڕوونە لە ناوەخۆ ئیسلامیەکان لایەنگرێکی زۆریان هەبوو بۆ حکومەتیش زۆر کەم جا هەر درزێك و هەر بێ سەروبەریەك لە قازانجی حکومەت دایە، بۆیە حکومەت قازانجی کردووە زۆر خەڵك چەکی بۆ بەرگری لەخۆ هەڵگرتووە سەر بە حکومەتن. هەروەها ئامانجە گەورەکەش لەوەیە لەگەڵ سەرمایە داری جیهانی تەقەلای ئەوە بدەن کە دیمەنی ئیسلام ناشیرین پیشان بدەن. دیارە هەر ڕۆژنامکە و هەر لایەنی ئەو پروپاگەندەیە دەگەشەنێتەوە ئامانجی خۆی هەیە، بەشی زۆریان حەسوودیە ر لە چارەنووسی خۆیان دەترسن نەوەك وەك جەزائیر لە ڕووی فیکر و جەماوەرەوە قەڵۆش بن.

## بەشی هەشتەم

# پەیوەندی جەزائیر بە کێشەی کورد

خەڵکانێکی سادە هەن وا دەزانن و دەپرسن ئاخۆ چ پەیوەندیەك لە نێوان ئێمەی کورد و کێشەی جەزائیر هەیە...، بەڵام زۆر روونە نەك جەزائیر لەو سەردەمەدا هەموو رووداو کێشەکانی جیهان بەیەك بەستراون ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، سەرکردەی نەزان سەری لێدەرناچێت و ئەو پەیوەندیەی پێ نادۆزرێتەوە و ئەو جیهانە گەورە لە کۆلانکەیەکی تەسکی خۆی دەبینێ، ئیدی زۆربەی کەم و کورو قەیرانی سەرکردایەتی لەوە و سەرچاوە دەگرێ، پێغەمبەر (ﷺ) کۆمەڵگەیەکی وا رۆشنبیری دروست کردبوو کە هەمووهاوەڵەکانیش دەیانزانی رووداوێك لەو سەری دونیا روویدات چ پەیوەندیەکی ئیجابی یان سەلبی بە کاروانی ئیسلام و بانگە پیرۆزەکەی هەیە بۆیە هەومنتە نەبوو کە هەموو ئیسلامیەکان پێیان خۆش بوو رۆم بەسەر فارس کەوێت. ئێستاش زیاتر جیهان بەرەو خەملینی سەربازگەی هەق و ناهەق دابەش دەبێت، کە خەڵکی هەق پەروەر و زەحمەتکێشانی جیهان لەسەربازگەمیەك دەدۆزنەوە جیا لەو سەربازگەیەی تا هەق دونیا خۆر و لە خۆبایی زۆر دارە. ئەوە بەگشتی بە تایبەتیش ئێمەی کورد بەهەردوو تەوەری ئیسلامی و کوردایەتیەوە لەو دابەشیە زۆر هاوچارە نووسین.

**تەوەری ئیسلامی:**

زۆر روونە کێشەی جەزائیر لە نێوان دیموکراتی و نا دیموکراتیانە (بەپێی یاسای خۆیان)، لە نێوان گەل و عەسکەرە، هەق و ناهەق، لە نێوان شەریعەتی ئیسلامیو شەریعەتی سۆسیالستی دیموکراتیە. .. واتە ئیسلام و نائیسلام، جا چ لەوە زەق تر هەیە کە ئیسلامیەکانی کوردستان هەموو هەق خوازێك دەبێت بە ووردی چاودێری رەوتی رووداوەکانی جەزائیر بکەن بەرەو کێ ساغ دەبێتەوە. ئەزموونێکە رژێمی جیهانی نوێی لێتاقی دەکرێتەوە و دەریش ناچێت کە ئەو تاقی کردنەوە وا لە پێش هەموو گەلانە، جا بۆیە پەیوەندیەکی پتەوی ڕاستەوخۆی ئیسلامیەکانی کوردستان هەیە چ سەلبی چ ئیجابی.

**تەوەرەی کوردایەتی:**

ئێمەی کورد لە ژێر یاسا و سیستەمەکانی سەرمایەداری جیهانی وامان لێقەوماوە لە پەیمانی سایکس پیکۆی ١٩١٦دا دابەش کراین و هەر ئەو کۆسپە گەورەیەش ئێمە وەك گەورەترین میللەتی سەر رووی ئەو زەمینە بێکیا نین، دەریشکەوت بەو بێداریەی شیوعیەت و لە پێشیشدا سۆشیالیستیەت نموونەی تەییاری نەتەوایەتی عەرەب لە پێش چاووە چارەی ئەو کێشەیەی ئێمەی

پێنەبوو، چونکە گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی نەبوو هەر لە چوارچێوەی عەلمانیەت بوو، بۆیە ئێمەی کورد پێویستیمان بە گۆڕانکاریەکی بنەڕەتیە لەهەڵ و مەرجی ئیقلیمی و دووەلی تیایدا ئەو یاسا و عورف و پیرۆزیە چەسپاوانەی بوویتە کەلەمچەی گەلانی ژێر دەست هەڵتەکێن وەك (یاسای دەست تیۆمردانی ناوخۆ)، (سەروەری وولات)، (بچووك بێتە قوربانی گەورە) و (ناو لێنانی بەرگری و شۆڕشگێری بە تیرۆر)...هتد. بۆیە ئەو گۆڕانکاریەش کە بە شیوعیەت و سۆشیالیستی و تەییاری نەتەوایەتیش نەهاتەدی تەنیا بە ئیسلام دێتە دی، هەر بۆیەش هەقی خۆمانە بە ووردیسەرنج بدەینە شۆڕشی جەزائیر و سەرکەوتنی ڕاستەوخۆ کار لە بزووتنەوەی کورد دەکات لەهەر سێ گۆڕەپانی ناوەخۆ و ئیقلیمی و دووەلی.

## هەردوو تەوەرە (ئیسلام و کوردایەتی):

لەپێش شۆڕشی ئیسلامی ئێران ۱۹۷۹ یەك پەیمانی سێ گۆشەی خنکێنەر (شای ئەمریکی، عیراقی سۆشیالیستی، تورکیای ناتۆ) هەبوو دژی کورد لەگەڵ ئەو شوناسنامە جیاجیایانەشیان و ناکۆکیانەی هەیان بوو، دیارە ئەوەی کێشەی کوردی زۆر ئاڵۆز کردووە ئەو وولاتە ئیقلیمیانەی کوردیان دابەش کردووە بەرژەوەندیەکانیان لێی گەورەترە لەهەر ناکۆکی‌یەکی تری هەیان بێت، بۆیە:

۱-یەکێ لەو ستراتیجیە سیاسیەی کورد لە ئاستی ئیقلیمی و دووەلی ئەوا وا ڕژێمێك بێتە سەرکار ناکۆکیەکانیان گەورەتر بێت لە بەرژەوەندیان لەسەر کورد.

۲- یەکێکی تر لەو ستراتیجیە وا ڕژێمێك بێت تەبا نەبێت لەگەڵ وولاتانی بڕیار بەدەستی جیهانی کە درێژ کراوەی دروست کەرانی بڕیاری سایکس پیکۆن،.. دیارە ئەو ڕژێمەش بە گوێرەی ( (یاسای بەرژەوەندی) کەیاسای ڕەوای نێو دەوڵەتی بووە تا ئێستا) لەچوارچێوەی عەلمانیەت پەیدا نابێت،چونکە هەتا کارل مارکسیش دانی بەڕەوایی کارگەی ئابووری هێناوە وەك یەکلا کەرەوە نەك (مەبادئی) واتە: نە لە سیستەمی سەرمایەداری و نەشیوعیەت و نەسۆشیالیسی و نە نەتەوایەتی، بۆیە بەدوای واها سیستەمێکی رادیکالی مەبدەئی زاڵ بێت بەسەر بەرژەوەندی (واتە: سیستەمێکی رەووشتدار) ئەوەش تەنیا و بە تاقی تەنیا لە ئیسلام دۆزرایەوە، ئەزموونی ۱۸ساڵی ئێران بەچاکی ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەوە یەکێکیانە، هەر بۆیەش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کاری زۆر بە قوولی کردە سەر بزووتنەوەی کوردایەتی و تەکانێکی بەهێزی پێدا، جا ئەگەر وەها سیستەمێکیش لە تورکیا و عێراق و سوریا بهاتبایە دی ئەوە کێشەی کورد بە دەیان هەنگاوی مەزنی سیاسی و نیشتمانی و یاسایی دەئاویشت، هەر بۆیە لەوپەڕی هەڵەدان ئەو نووسەر و ڕۆژنامانەی شۆڕشی مجاهدانی جەزائیر لەکەدار دەکات بۆیەش لەوپەڕی بێ ستراتیجیەت و بێ ووردبوونەوەیە کاتێ هاوڕێیانی (PKK) و یەکێتی لایەنگری (مسعود یەلماز)یان کرد نەك (رەفاه) لەمل ملانێی هەڵبژاردنەکەی ساڵی ۱۹۹۵، هیچ حکمەتێکی تیا نیە چونکە (یەلماز) هەر لە چوارچێوەی عەلمانیەتی تورکیایە و پیرۆزی ئەتاتۆرك و دەستور و وابەستەبە (ئاسایشی نەتەوایەتی) و ..... لە کاتیکا ئەگەر حزبی (رفاه) بەتەواوی فەرمان ڕەوا بێت ئەوا ئەو کۆسپ و تەگەرە سەرەکیەکان ساف

دەکات و دیسان لا دونیایەکی پیوەدراو لەسەر کورد ئاوەلاّ دەکاتەوە دیسان کاریکی گەورەی قوولی دەرکردە سەر هەل و مەرجی ئیقلیمی و دووەلی بزووتنەوەی کوردابەتی کە بە کورتی ئەوانەن:

١- لەگەل ناهەقی نێو دەولەتی ناگونجی و لەگەل زوردارانی ناوچەش هەردەم دژوارن کە کورد تا ئیستاش قوربانی ئەو دوو تابایە بووە.

٢- شوێنی کورد ئەگەر بە ئیسلامیش نەبێت هەر بە کوردایەتی رووت ئەوا ئەو وولاّتانەی ناتەبا بێت لەگەل گەورە بریاریە دەستانی جیهان کە کورد لە قاموسیاندا لاپەرەی نەبووە و بەشێکە لەکاروانی کوردایەتی.

٣- ئەو فەرمان وەرگرتنەی ئیسلامیانە رەنگە بێتە هۆی تێکەل بوونی دوو پارچەی کورد یان هەموو کە کۆسپی بنچینەی قەیرانی کوردە.

٤- بێجگە لەوەش وەك یاسای بەرژەوەندیش وەها وولاّتێکی خاوەن سیستەمی ئیسلامی دوژمنی زۆر دەبێت قەیرانی کورد زیاتر بەرە و دووەلی دەروات ، بۆیە هەر گۆرانکاریەك لەو جیهانەی ئیستا یان لە خزمەتی بەرەی سەرمایەداری و داگیرکەرانی دارێژی سایکس پیکۆن یان لە دژایەتی کە بەرەی ئیسلامە وەك بدیلی سەرمایەداری خوێن وگۆشت و لق و پۆپیەوە، هەر بۆیەش شۆرشی جەزائیر نەك هەر لەلایەك بگرە بەدەمیان لا راستەوخۆ پەیوەندی بە کێشەی کورد هەیە، ستراتیجیەتی وەك دەرفەتێکی ناپاب و دەگمەن وا رێك کەتووە کە (مەبادئی و مصالح) کۆببێتەوە واتە: دەتوانرێ ئیسلامیەکان و عەلمانیەکان (ئەگەر عەلمانیەکان بەراستی کوردایەتی پەروەر بن) ئەوە ئامانجە دوور و نزیکەکانیان جووت بووە، خەباتی نیشتمانی و کۆمەلاّیەتیان ئاوێتە بووە.

بۆیە لە بەرژەوەندی رێبازی کوردایەتی رەسەن نییە دژی بزووتنەوەی ئیسلامیەکانی جیهان بن چ بە گوفتە چ بە کردە.

## رەوایی کێشەی کورد لە روانگەی ئیسلامەوە:

هەموو جۆرە رەگەزپەرستێك چ خێلەکی چ ناوچە گەری چ نەتەوە پەرستی یان چینایەتی لە ئیسلامدا بە توندی رەت کراپەتەوە، بەلاّم ئینتیمای مرۆڤ بۆ هەر بەشێکیان ئاسایی‌یە ئەگەر نەکرێتە روانگەی ئەو مرۆڤە، لە وەلاّمی ئەو پرسیارەش بۆ پیغەمبەر (ﷺ) لە بارەی (عصبیە) فەرمووی : کە لە (ظلم) یارمەتیت دا ئەوا (عصبیة)تە، زۆر بەداخەوە ئیسلامیەکانی عەرەب پێش ١٩٧٩ زۆر لە ژێر کاریگەری فیکری نەتەوایەتی عەرەب بوون، هەتا بەرێز شەهید(حسن البنا) رەحمەتی خوای لی بێ، سەرنج بدە دەلێت:(...بە راستی ئەو فەرموودەیە هەقە:﴿اذا ذل العرب ذل الاسلام﴾ ئەوە فەرموودە نییە و باشترین بەلگەی پێچەوانەی ئەو بیرە ئیمام عمر(ﷺ) فەرموویەتی:﴿کنا قوما أذلاء فأعزنا الله بالاسلام﴾ وە محمد العمارە لە کتێبی(جمال الدین الافغانی) هەولێکی زۆری داوە بیسەلمێنێ‌کە (جمال الدین) عەرەبە،بۆیە ئەو هەموو ستەم و قر کردنەوەی کورد بەداخەوە هیچ دەنگ هەلبرینێکمان نەبیست لێیان. بە لکو بە پێچەوانە ناویان بە (انفصالی) و لایەنگیری أسرائیل بردین لە کۆتایی‌دا لایەنگیری عێراق بزوین دژی ئیمە هەر وەك لایەنگیری عێراق بوون دژی ئێران ئەوەش روونە لە روانگەی عروبة).(الأمة العربیة) وە نزیکە نەك لە ئیسلام تا ئەو رادەیە برایانی (ئیخوان) لە سوریا

بەرەیەکیان لەگەل حزبی بەعسی عیراقی دروست کرد لە وەلامی پرسیارێك لە عەدنان سەعدەدین رابەری برایان لە سوریا لە گۆڤاری (الوطن العربي) ژمارە (١٦٨٢) لە بارەی حیزبی بەعس ووتی (حزب البعث العربي هو الاصل ولم نجد بيننا وبينهم أي تناقض) زۆر نمونەی ترمان لەبەر دەستە .پێناسەی کێشەی کورد سادەیە ئەگەر بۆ (امة العربية)بۆ فارس بۆ تورك هەبێتوولاتێکی سەر سەخۆیان هەبێت.بۆ کوردیش هەروەهاکەواتە ئەوە بۆ (انفصالە) لە وولاتی ئیسلام ، نەخێر نەتەوە پەرستی عەرەب خۆیان (انفصالن) لە ئیسلام هەردەمێك فەرمان رەوای ئیسلامیبێت کورد لەهەمووان زیاتر گوێ رایەلە و دلسۆز ترە بۆ ئەو ئامانجە پیرۆزە هەتا لە رێی ئەو ئامانجەشدا ئەو کێشەیە لە پێشدا حزبی شیوعی عیراقی لێی بە هەلە داچووە و گەیشتنە قەناعەتێك کە بچنە بەرەی حیزبی بەعس دژی کورد لە سالی ١٩٧٢ ئەو هەموو ناپالم و چەکی کیمیاییان زۆربەی لە سۆڤیێتەوە بۆ دەهات هەتا (حوکمیزاتیش)یان پێ زیاد بوو، هەموو جار (صدام حسین) دووبارەی دەکردەوە و دەیوت: شیوعیێك هەلسا لە کۆبونەوەیەك و گوتی:(سيدي لماذا الحكم الذاتي؟، واتە پێویست نییە) جا بۆ ئەوەی جیهادی خەلکی کوردستان بۆ رزگاری ئەوەندە ماندوو نەکرێت بە تاقیکردنەوەی تاقیکراو وەکو مەسەلەی میسری کەدەلێ (يطبل في المطبل) وە پەند وەرگیرێت و لەکوردستان تەیار و بیروباوەری وا کلاسیکیو لاسایی کردنەوەی وا پەیدا نەبێت و لە هاوینی کوردستانا چەتر هەلنەگیرێ چونکە لە مۆسکۆ باران بوو، نابێت کەش و هەوای سیاسی ئوردن یان وولاتانی کەنداو یان ئۆروپا بکەینە تەرازوو بۆ کوردستان و بلێین بەرگری چەکداری لە کوردستان بیدعەیە یان قۆناغی نەهاتووە یان حەرامە... ئەوەیان کارەساتە مادام بۆ چیچان و فلسطین و کشمیر و بەرەی مۆرۆ و ...هتد، جیهادی چەکداری ئەرکی پیرۆز بێت و بۆ کورد و ئیسلامیەکانی کوردستان مەکتەب عەسکەری حەرام بێت ئەوە تێکەوتنە و هەلخلیسکانە ناو روانگەی ئەو خەتە ئیسلامیەی کە تا ئێستاش لە ژێر کاریگەری نەتەوایەتی و رەگەز پەرستی عەرەبن کە ئایدیۆلۆژیای (میشیل عەفلەق و ساطح خضری و خیر الله طلفاح) زادەی ئەو ئاوێتەن و ئێمە لە دەستیانا قڕ کراین و کیمیا باران کراین، بە زیندوویی لەبن گلّ کراین، هەر لەو روانگە خوار و خێچەدا لە دواییشدا بەناو ئەنفال کراین، وەك وەصیەت: نابێت کورد چاکەی شیعەکانمان لە بیر بچێتەوە لە خواروو کە دژی ئەو رەوتەی حزبی بەعس وەستان وە (أ.محسن حکیم) لەسەر ئەو هەلوێستەی ئەزیەتی دیت و تا ئێستا (٦٩) شەهیدیان لە بنەمالەکەی خۆیان هەیە، کەچی کۆمەلێك مامۆستا و مەلای سوننی ناوەراستی عەرەب کە لە ژێر ئەو کاریگەرییە بوون و فتوای ئەو ئەنفالەیان بۆ حزبی بەعس دەرکرد، بۆیە لەسەر ئیسلامیەکانی کورد پێویستە زیاتر خۆیان لە بەندیخانەی تەبەعیەت و لاسایی کردنەوە رزگار بکەن و راستی کێشەی کورد بۆ جیهان و بۆ ئیسلامیەکان راست بکەنەوە، بۆچی ئێمە لێرە زانیاریمان هەبێت لەسەر جەزائیر کەچی ئەوان بێ زانیاری بن و هەندێکیان سەردان و دەستخۆشیان لە (صدام) کرد لە سالی ١٩٩١ ئەگەر وا بێ زانیارینە بۆ دەبێت ئەوان رابەری ئێمە بن لەسەر چ بنچینەیەك؟.

**•چـی بـکـەین؟:**

رەوتـی بنویژدانـی حـیزبی بەعـس عـیراقی گـەیاندە ئـەمرۆ کـە نزیکـەی(٤٠) بریـاری **(UN) ی بۆ** دەرچوو و بەندی کردووە، ئەوە دیاری رەگەز پەرستی عەرەبە بۆ عەرەب خۆی کە عیراق و **جەزائیر** و میصر و تونس پێشەنگنتی. ئەو هەموو سامانەی بەو چەکە قورسانە دراوە وا بە مەسروفی هەمان سامان تێك دەشکێن وەك دەمی مشار بەهاتن و چونی هەر عەرەب خوی دەبری. بە کورتـی حیزبی بەعس کارێکی وای بە هەموو عیراق کردووە دەبێتە هۆی پارچە پارچە بونی عیراق چ بـە لێدانـی (صدام) یان بە دادگا کردنی چونکە رەوتی عیراق لە ژێر ئەو بریارانەی (UN) کۆتـایی دێت بـە کەوتنی (صدام) بە تایبەتی بە (ملف حقوق الانسان) مافی مرۆڤ و هەموو ئەگەرەکانی چارەنووسی عیراق وا دەردەخا کە فەوزایەکی درێژ خایەن لە نێوان ناوەراست و خواروو روو بدات لەبەر هۆیەکی سادە چونکـە هـەر گۆرانکاریـەك لـە عـێراق ببێـت ئـەوا بەدیلەکـە بەرەلسـتکارەکانی خـوارووە، ئـەو ئەنجامـەش بـە دڵـی رۆژ ئـاوا نـییـە بۆیـە لـە ئـەنجامی یارمـەتی دانیـان بـۆ بەرهەڵسـتکارانی لاوازی ناوەراست دریـژە بـە هاوسـەنگی مانـەوەی فەوزایەکـە بـدات لـە ناوەراسـت و خـواروو، بۆیـە لەسـەر ئیسلامیەکان و نیشتمان پەروەرانی کورد پێویستە خۆ ئامادە کەن وە ستراتیژیەتی خۆیان بۆ ئەو چارەنووسە دارێژن و نەبنە بەشێك لەو فەوزایە کە دیسان مافورەکان دەبنەوە ریس و لە ریسیشەوە بو خوری و حارێکی تریش دەبنەوە مافور و با کوردیش مافوری خۆی هەبێت و لەسەر ئەو مافورە هاوار بکەین: سەرکەوێ جیهادی پیرۆزی خەڵکی جەزائیر.

## **کۆتایی هات**

تێبینی لە سەر پەرشتیار:

لەبەر کەمی توانای چاپ و بۆ ئەوەی زۆرترین خەڵك نوسراوەکانمان بخوێنیتـەوە و لـە بارەی نێو دەوڵتی و مەسەلە ستراتیژیەکان بگەن بە راستی ئـەوا وەك ئـەرکێکی ئیسلامی داوایان لێ دەکەین لەدوای خوێندنەوەی بە سرنج ئەو نووسراوانە بەند مەکەن و وا بکەن زیاترین خەڵك بیخوێنیتـەوە... خوای گەورە بە پاداشتی بۆ حیساب دەکات ان شاء الله...

**مسعود عبدالخالق**

هەولێر

١٩٩٨

کێشەی جەزائیر پڕیەتی لە بەڵگەو پەندی زۆر بەکەڵک لە هەردوو ڕووی فکری و کاری سیاسیەوە ،وولاتێکە هەر چوار ڕێبازی کۆمەڵایەتی ئێستای جیهانی (لیبرالی)-شیوعی - سۆشیالیست- ئیسلامی) لێ کارخرا لە زەمینەیەکی دیموکراتی ووشیاریدا لە ئەنجامدا ئیسلامیەکان بە ٨٦٪ی دەنگ سەرکەوتن بەڵام ئەم ئەنجامە لەلایەن فەرمان ڕەوایەکان و بەدەست لە پشت دانی دنیا خۆران هەڵوەشێنرایەوەو بووە زەقترین کێشە لە جیهانی نوێدا کە هەق و ناهەق ئەوەندە بە ئاشکرا لە ناکۆکی دابن.

بۆیە کێشەی جەزائیر بۆ هەموو لایەک ئەزموونێکی دەوڵەمەندە بۆ هەموو لایەن و کەسێک لەو کوردستانە دەتوانی چارەنووسی خۆی لە وێنەی جەزائیر بدۆزێتەوە ئەگەر دیموکراتی خوازە یان ماف پەروەرە یان داد پەروەرە بەهەر چی ئارەزوویەک بیەوێ.....